# پڕم لە عیشقی تۆ



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی رۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

# پڕم لە عیشقی تۆ

فەرەیدون سامان



کتێب: پڕم لە عیشقی تۆ - شیعر
نووسینی: فەرەیدون سامان
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٤٦٨
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
مۆتیڤ: ستار قادر
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٦
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٣٥٥)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ



## عاشقترین عاشق

دوورترین ڕێگا
لە نزیکترین خاڵەوە دەست پێدەکات
سەختترین هەڵەموت
بەهەنگاوێ تەواو دەبێ
تاریکترین شەو
لە بەرەبەیاندا ون دەبێ
ساردترین زستان



لەگەڵ یەکەم هەناسەی بەهار
ئاوا دەبێ
گەرمترین هاوین
لەگەڵ یەکەم سروودی خەزان هەڵدێ
تاڵترین ژەهر
کە عاشق نۆشی دەبێ بەکڵۆ شەکر
گەرمترین ئاگر
کە داوێنی دڵی گرت
خامۆش دەبێ وەک رنووە بەفر،

عاشقترین عاشق منم
لێرەوە عیشقی من دەست پێدەکات
ئەی نزیکترین ڕێگا
ڕووناکترین شەو
گەرمترین زستان
شیرینترین ژەهر
خامۆشترین ئاگر.

پاییزی ٢٠٠٥



## پڕم لە عیشقی تۆ

پەنجەکانم تامەزرۆی پەنجەکانتن
لێوەکانم تاسەباری لێوەکانت،
تاڵ
تاڵ
گەڵای پرچت دەهۆنمەوە
لە نێو مێرگی سەوزی چاوەکانت
وەنەوزێ دەدەم



سێوی سووری کوڵمت دەڕنمەوە
لیمۆی زەردی لێوت دەمژم
سمۆرەی دڵم
ئاوێزانی چناری باڵات بووە،

هەناسەم
ئاوێتەی هەناسەت دەبێ
خوێنم، تێکەڵی خوێنت

عیشقت سەرابێکە
ڕێگا دوورەکانم
لێ نزیک دەکاتەوە
شەوگاری تارم، ڕووناک
دەبیتە خۆرەتاو
لە سەرماو سۆڵەی زستانی تووشی زەمەن
گەرمم دەکەیتەوە
تەنیایی ژوورە ساردو سڕەکەی ناخم
پڕ جۆش.

عیشقمان سەرابێکە
واتایەکی دیکە بەژیان دەبەخشێ
عیشقمان شەرابێکە
تێرو خەست
هەمیشە مەستمان دەکا
قەڵەمێکە تۆماری لە دایک بوونێکی دیکە

دەنووسێتەوە،
کەمن و تۆ لە ڕەگێکی دیکە خوڵقاوین
زەمەن دەوەستێ
شوێن واتایەک نابەخشێ

ئەی جوانتر لە جوانی
میهرەبانتر لە میهرەبانی
کەلە عیشق و مەحاڵ دەدوێین
هەرچی باڵدار هەیە هەڵدەفڕن
ڕووبارە سەرمەستەکان لە ڕۆیشتن دەکەون

سەرەنجام هەرچەند
گشت دەروازەکان بەڕووماندا داخراون
ڕێی گەڕانەوەشمان بۆ نییە
پاسەوانەکان
تارمایی ئاسا بەدوامانەوەن

بەشەکەتی و تاک و تەنها
لە پشت شورای پۆلاینی نیگەرانی
بەجێ ماوین،
لە دوورایی دوورەوە
دەنگت
دەخزێتە نێو قورگم
هەناسەت
دەچێتە نێو سییەکانم



ڕەنگت
ڕەنگدانەوەی ڕەنگی منە
دەنگت
زایەڵەی دەنگی خنکاوی منە
هەنگاوەکانم
شێتانە دەچەقن
ئەسپەکەشم بریندار و تێنوو
ئەی ئەفسانەی سنوورە بەزیوەکانی ماقووڵی
تۆ برینی جیاوازییەکان هەڵدەوەشێنییەوە
لە فەرهەنگی قاچاغی عاشقە دۆڕاوەکاندا
زمانێکی دیکەی مەحاڵ
دەنووسیەوە...

پاییزی ٢٠٠٥



## پاسارییەک دێ

بەسەرگەردانی
وێڵ بەدوو دوا گۆشەی خەڵوەتی
شاری مەیکەدە نشینان،

زامی نووچدانی
لەبەردەم دەروازەکانی مەرگدا
ئاوێتە دەبێ



بەخوێنی پاسارییەکان
گەڵا وشکبووەکان تێراو دەکاتەوە،
عیشق ڕێبوارێکە
سەر هەڵدەگرێ و
لە سێبەری خۆی ناڕوانێ،

بەنێو شاری لە تەم هەڵکێشراو
شاری دەروێشانی مودمین بەعیشق و خۆکوژی
لەبەر تەکیەی نزاو نوێژ و سووتان
سەرمەستانە سروودی نەفرینی ئەڤین دەڵێنەوە،

(چ کەرنەڤالێکی شێتانەیە...)،
کەژاوەی بووکێنی تەم
بەرەو مەنزڵی ونبووی سەراب بەڕێ دەکەن
دەفی ژیان دەژەنن

ئاوێنەکانی خەیاڵ ورد و خاش دەبن،

لە نێو ئەو پۆلە پاسارییە کۆچەرە
پاسارییەک دێ و
چاوەکانی چاوەڕوانی بێهوودەی
بۆ ژوانی ئەڤینداران دەگێڕێ
چیرۆکەکانی یادەوەری بە زیوان دەسپێرێ،
تا چاو دەبێ
بەتاڤگەی فرمێسکی خوڕەم

بەسەرگەردانی
بەسەر شووشەی وردو خاشی ئاوێنەکان گوزەر دەکا
لە نێو ئەو تەمە چڕەدا
دەبێتە ئایەتی گوناهێکی دێرین
بەر نەفرەتی خوداکان دەکەوێ،
تا سێبەرێ لە پەڕەی وەریوی باڵە میهرەبانەکانی چێ بکات
لە ئاست سووتانی بەر خۆرەتاو
سەرمەستترین سروودی عاشقانی
شاری مەیکەدەنشینان دەچڕێ
لە ئەفسوونی چیرۆکی بوون و نەبوون حاڵی نابێ،

چ گەمەیەکی پووچە نەمری
چ وەهمێکی جوانە دوورایی ڕوانین بۆ ئاسمان،

پاسارییەکە دۆن فڕێدەدا
دەبێتەوە شازادەی چیرۆکی بەردەم دەروازەکانی ژیان
لە شەوی نووتەکی کۆچی شاسوارەکاندا

دەروازەکانی مەرگ دادەخات
ئەفسوونی بوون بەتاڵ دەکاتەوە
دەڕوانێتە زەردەخەنەی بێگەردی
جوانتر لە جوانی،
لەبەردەم تەرمی پاسارییەکان
نوێژی عیشق دادەبەستێ
گوناهبارانیش دێن بەناوی تۆوە



بەرد بارانی دەکەن،

لەو شارە لە خاچدراوە
گەردەلوولێک هەڵناکات
تەخت و تاراجی
ئەو کەرنەڤاڵە ڕەشپۆشە ڕاپێچێ،
خدریش نایێ
نزایەک بۆ ڕۆحی هەڵپرووکاوی گیاکان بکات
تا لەبەردەم گەڵاو باڵندەکان
دوا نامەی هەورە باران
بۆ گوڵەگەنمە ڕەنگزەردەکان بخوێنێتەوە،

تا ئەو دەگەڕێتەوە
درەختەکان وشک دەبن
باڵندەکان دەمرن
دیوار،
کۆلان،

تەنانەت جادەکانیش بۆنی تۆیان لێ دێ،

دێت و
سەرهەڵدەگرێ
لانکی بێداری شەو ڕادەژەنێ
لە خۆی دەپرسێ:
بوون لە نەبووندا چ خەونێکە!

لەسەر تەرمی پاسارییەکان
گۆرانییەک دەسترێ
شەپۆلی خەیاڵی بەرەو کەناری بێهوودەیی ڕایدەپێچێ
ئاوێتە دەبێتەوە
بەتەمی شاری غوربەت،

شەقام
گەڵا
باڵندەکان
لە نێو تەمدا بزر دەبن
ئاویش بۆنی تۆی لێ دێ،

چاوێک، تێی دەڕوانێ
بەدەستەکانی
سەما بەجۆلانەی بەرەبەیان دەکات،

پاسارییەکە دەگەڕێتەوە
پەڕەیەک لە باڵی ڕۆژژمێری
یادەوەرییەکانی بەردەداتەوە
دواتر خۆی دەخاتەوە نێو کانیەکی زوڵاڵ

باڵەکانی سێبەری مێرگێکی جێماون،

ڕەنگە لە بنارێکدا
هێلانەیەک



بۆ بێچووەکانی چێ بکات
یان لە بزنەڕێییەکدا
ببێتە چۆڕێ ئاوی زوڵاڵی کانی
بۆ نێو قوڕگی ڕێبوارانی شاری سەراب
یان...

پاییزی ٢٠٠٤




## هەڵیسانی تەم

چاوەنوارێم بیابانێکی وشکەڵان بوو
نەمێرگی میهرێ
هانای دڵۆپی بارانی بۆ هێنام
نە تینوویەتی سڕبوونم شکا
سێبەری گیای زەردەخەنەیەکیش بەدی نەکرا،

من دەخنکام و لە نێو گێژەنی تەنیاییمدا



ڕووبارێک عەتر لە چاوانم هەڵدەقوڵان
چیم نەدەبینی جگە لە:
بێ داڵدەیی بۆ ئامێزی بۆشایی
نوێژی عیشقێکی بەسەرچوو
لە پەرستگای یادێکی وێراندا
برینێک لەسەر  خەنجەر ڕاکشاو

چیم نەدەبینی
لەم بیابانییە وشکەڵانە
چرپەیەک بووە هاوار
بێ دەنگیمی خنکاند
شێت بوونمی وروژاند
ماتیم بووە زایەڵەیەک
دڵی سەختی بیابانی شەق کرد،

وەنەوزی بارانێکی حەسرەتکێش
لە چاوانی من
چاوی گەواڵە گرینۆکەکانی وەژان دێنا
بێ ڕەنگیم بووە تیشکۆی برووسکەیەک
گڕی لە ساتەکانی بێ هوودەییم بەردا،
من شێت بووم و لەو سەر زەمینە جەنجاڵە
تەنێ وشکەڵانی بیابان بەهانام هات
گێژەلووکەکەی هەڵدەکات
لانکی شووشەی خەونەکانم ڕادەژەنێ

خەونەکانم دەبنە بارستەیەک خۆڵەمێش
گەڵای زبوین دێنە خوارێ
من بەرگی گەڵاکان دەپۆشم،
شیوەنم نزای شمشاڵێک بوو
لە نێو قوڕگی تینوویەتی هەڵقولا
زەماوەندی گرێکی هەڵایساو بوو
بەرگی ناسووتم وەلانا
خۆریش پرچە ئاڵتونییەکەی سپی چووەوە
بەسەر جەستەی شەکەتی بیابان پەرت بووەوە

هەناسەی بیابان
تەم بوو
هەناسەی منیش ئاگر،
من سێبەری هەنگاوی سەرەڕۆم
لەسەر زمانی پشکۆ ئەو
لەسەر دڵی تاشە بەرد جێ هێشت،
ستوونێک گڕ بووم
لەسەر شۆستەی نامۆیی شاری سەرگەردانی دایسام
ڕۆحیشم بڵێسە بوو
سەبووری دا بەشەپۆلی یادێکی کۆچکردوو
تا لە کەناری ئەو خاکە نامۆیە چاوم لێکنا.

ئەڤین پەرەسێلکەیەک بوو
بەنێو شاری سەرگەردانیم



بەرهەڵدابوو
ئیدی نەگەڕایەوە
دەگەڵ هەڵایسانی تەم
بووە خەونی خۆڵەمێشی
چیرۆکی بەر دووکەڵی چڕی ئاگردانی شەوانێ
دەنگی شوومی کوندەپەپۆ واگای هێنا
نەفرەتی ناشایستەیی لێ کرد،

من چیم نەبینی جگە لە
مەرگی ڕەنگی خۆم
تراویلکەی دوا ساتی خۆزگە
هەناسەی ساردی نائومێدی پەپوولەیەک
دڵۆپە شەونمێکی ژەهراوی
ناڵەی شمشاڵێک
لە شیوەنی بەسەرهاتی کۆچی ئەستێرەکان
کە لە ئێوارەیەکی تەماوی بیاباندا هەڵکشا
زەردەخەنەی تاڵی پەلکە زێڕینەیەک
لەسەر لێوی قڵیشاوی وەرزەکاندا ئاوابوو،

لەو بیابانە وشکەڵانە تۆپەڵێک تەم بووم
پشکۆی گڕی ئەڤینیش لە چاوانم دایسا،

لە پەرستگای یادێکی وێراندا
دوا نوێژم بۆ تەم کرد،

خۆر ئاوابوو
تیشکەکانی پێ بەخشیم
گێژەلووکە، یاخی بوونی
بیابان، وشکەڵانی و
بەرگێک لە لم،

گیایەک بووم لە نێو گڕدا ڕوام
لەسەر ئاودا وشک بوومەوە
مەرگ ناوی نام چاوەنواڕی.

زستانی ١٩٩٤



## وێرانەگەیشتن

خودایە ئەڤینم پێ ببەخشە
وەک مشتێ هەتاو
تا ژووری تاریکی ناخم ڕۆشن بێتەوە،

ئەڤینم پێ ببەخشە
وەک چۆڕێ ئاو
تا هاواری تینوویەتی منی خنکاو



نەگاتە کەشکەڵانی ئاسمانت،
من ماسییەکم لە نێو حەوزێکی کۆنکریتیدا
شەپۆلە بەردینەکان
دەمخنکێنن،
زەمەن تۆفانی پۆلایین ئاسا تێدەپەڕێ
بەشی خۆشەویستیمان ناکات،

وێڕا ناگەین
کۆشکی کریستاڵی ئەندێشە وێران دەبن
چراکان دەکوژێنەوە
باخەکان وشک
گوڵە جوانەکان دەپووکێنەوە
شەپۆلە هارەکانی دەروون خامۆش

وێڕاناگەین
بەهەشتی منداڵیمان
لە پڕ بووە دۆزەخی پیری،

با بەزمانی باران بپەیڤین
نەبادا زەمین ببێتە بیابانێکی وشکەڵان
با بەزمانی هەتاو بدوێین
تا تاریکی بزرمان نەکات،

تۆش بەزمانی سروە بدوێ
نەک گێژەلووکەی تووڕە

لە هەڵچوونتا ، گەمی گەشتی چارەنووس نغرۆ ببێ

بەزمانی سێبەری مێرگێ بپەیڤە
کە لە گەشتی گەڕان بەدوو عیشقدا
لە گەشتی خۆدۆزینەوە
لە نێو ئاوێنە تێکشکاوەکانی سەرابدا
وەنەوز بدەین...

ڕەنگی گەڵاکانم پێ ببەخشە...
تا لە بەهار سەوزتر بم
دەنگی خوڕەی بارانم پێ ببەخشە
تا گۆرانییەکەم تەڕتر بێ
لە دڵی گەواڵە
خودایە ئەڤینم پێ ببەخشە...

زستانی ١٩٩٤



## دژ

سەرەتامان
کۆتایی بوو
کۆتاییبیەکانیش
سەرەتای دیکەن،
پەڕینەوە
گەشتی مەحاڵە
خۆڵەمێشە خەونەکانی بەیەک گەیشتن،



نێوانمان دەریایەکی قووڵی حەسرەت
پردێکی ئاگرین...

منم بارستەیەک خوێن
تۆپەڵێک خۆڵەمێش
تەرمێکی بێ سەرو شوێن

من لە بەرەکانی جەنگیشدا نیم
ڕۆژانە سات بەساتی ژینی پڕ ئازارم
دەکوژرێم
بۆ مەرگێکی دیکە زیندوو دەبمەوە
لە نێو کوانووی گڕیشدا نیم
دەسووتێم
دەبمە تۆپەڵێک خۆڵەمێش
بۆ شەوانێکی دیکە دادەیسێمەوە
بەپەتی سێدارەش هەڵنەواسراوم
دەخنکێم
زیندە بەچاڵ دەبم
وێنەی تەرمێکی بێ سەرو شوێن.

من لە ژێر چەترە کاغەزی شیعرەکانمدا
لەبەر هوروژمی تۆفانی نائومێدی
گەردەلوولی خۆڵاوی نامۆیی
ماڵۆچکەیەکم بنیات ناوە
ڕازی گوڵێکی سوورم
لە نێو خانەکانی جەستەم حەشارداوە،

تۆش لە خەیاڵی تەلاری ئاڵتون
باخی گوڵێک پەڕەی ئەڵماس
ڕووبارێک هەنگوین
لە دوورەوەش بۆ ئەستێرە ماتەکانی بەختم دەڕوانی
داخۆ کێهە هاوزای ئەوین و مەرگی منە،

ئەوەی لە یادەوەرەکانم جێماون
دەفتەرێکە
ئەدرەسی:
(ئەو برادەرانەی کوژران،
شێت بوون،
ئاوارەو شوێن بزر...)
جادەیەکی چۆڵ
کۆڵانێکی بنبەست
نیشتمانیش
دەمامکێکە
بەدووکەڵی ڕەشی چڵکن خۆی پۆشیوە،

ئیدی چۆن دڵم بەو درەختانە خۆش بێ
کە گەڵاکانی تەرم ئاسا بەسەریەکدا کەوتوون
سێبەری سەبووریم پێ نابەخشن،

من هەمیشە لە خەیاڵی سەفەر بووم
گەشتێک بەرەو ڕوئیا
ڕێیەک ئیدی گەڕانەوەی بۆ نەبێ
هەوارێک



کەسێ ڕەنگم
دەنگم
نەناسێتەوە

ئەڤین، هەناسەم هەڵدەمژێ
تراویلکە، تینوویەتیم.

مەتەڵی بوون و نەبوون بوو
یان ڕێیەکی پێچەوانە
بەیەک نەگەیشتین
مینا جەمسەرەکانی موگناتیس لە یەک دوور بووین
دوو زمانی
دوو سەردەمی جیاواز بووین
هەرگیز لە یەک نەگەیشتین

لە نێو هەزاران شەپۆلی ڕەنگدا
ناکۆکیمان تەباییە
کە سەرەتامان
کۆتایی بێ،
کۆتاییەکانیش
سەرەتا
ئاخر ئەفسانەی چ ئایینێکە
بەهەشت بۆتۆ
دۆزەخ بۆ من

زستانی ١٩٩٥



## له ژێر پێیدا ئاوەکان هەڵدەقوڵێن

پێڵووی چاوەکانی لێکدەنا
له هەموو بەرەبەیانێکی درەنگدا
بەر لەوەی بووکی کازێوە
تارا ئاڵتوونییەکەی والآ بکات
چیرۆکی درێژی ڕۆژانی غوربەتی خۆی بگێڕێتەوە:
لەسەر  پشتی بوراقەوە دێ
بۆ ئەودیو سنووری گوڵاڵەکان هەڵدەکشێ



له حوکمی بینین ئاوا دەبێت.

لەو فەزایە دوورەوە
ئەستێرەیەکی کزو مەلوول
جوانترین تەلاری له پەڕەی گوڵە وەریوەکان
له گلێنەی چاوە ئەڵماسییەکان بۆ تاشیوی
بەهێوری له پایتەختی عیشقت دەڕوانێ
لەسەر بڵندترین ترۆپکی شکۆییدا
تاجی خۆرت لەسەر دەنێ

(تۆ هێشتا پاشای مەملەکەتی عیشقی منی ....)

له کام بەرەی جەنگی پرسیارەوە
سوپایەک وەڵامی دۆڕاو
هاتنە سەر چۆک
بوویتە دیلی نێو قەفەسی ئەفسانەکانی
بوون ونەبوون
ئایەتەکانی قەدەر!

کام کانی سازگار...
ڕەگی خوێنی له ناخی تۆ ڕاکێشاوە
کام ترۆپکی سەرکەشی ئینسانییەت
شکۆیی تۆی بەبالآی خۆی گرتووە
کام زەریا له گەواڵەی چاوە خوێناوییەکانی تۆ هەڵقوڵاوە
تا ئاوا له سێبەری کەنارەکانی نامۆییتدا

بەدرێژایی ڕۆژانی ساڵ...
لە هەمان ئان و سات
کە بەپێوە ڕاکشای
وەک چۆن گوڵاڵە سوورە
لە زامی خۆی
بەرگێکی خوێناوی بپۆشێ،

ئەستێرە کز و مەلوولەکە
بەر لە بەرە بەیان
بەبەرگی تەمەوە لەگەڵ خۆیدا
ڕۆحی سەوزی درەختە وشکەڵانەکانی
بۆ جەنگەڵە بەردینەکان بار کرد،

چۆن کێوێ بەفر ببێتە مشتێ هەڵم
زەریایەک ببێتە دڵۆپی ئاوی باران،
ئەویش بووە گەردیلەیەک
چاوەکانی لێکناو ئاوابوو
بەسەر جەستەی پر حەسرەتی پێدەشتێکی تێنوودا
تیشک بەناو دەلاقەکانی فەرامۆشی
پەرش بێتەوە
لەبەردەم خوڕەمی تاڤگەکانی حەسرەتدا لێی ڕاکشا،
تا هەواڵ بگا بەمنداڵانی شاری تاریکی و تەم
بەداڵگی هەمیشە لە چەمەری
بەجۆگەی خوێنی پاساریبیە سەر بڕاوەکان،



پرسە پەڕینەوەبوو
بەسەر مەرزی بەئەسید تەلبەند کراو،

(کریڤی من بۆ نەهاتی...)
بەڵام
ئەو لە هەموو بەرەبەیانێکدا بەر لە کازێوە
لە هەموو ئێوارەیەکیشدا بەر لە بوولێڵ
لەبەردەم ڕۆحی ئاگرینی ئاهورادا کرنوش دەبا
سروودەکانی یەسنا دەهۆنێتەوە

لە ژێر پێیدا ئاوەکان هەڵدەقوڵێن
خۆیان لە ڕۆحی ئەودا هەڵدەکێشن...

پاییزی ١٩٩٧

(*) مەرگی شاخەوانی برا و هاوڕێم سروشی هۆنینەوەی ئەم چامەیەم بووە.



## جیاوازییەکان

کێشەکان
ڕێگ بنبەستەکانی چاوەڕوانی
دەرگا داخراوەکانی هێوی
هەمیشە بێ هوودەیی
نیگەرانی
لە نەستدا وشەیەکن
لە دایک نەبوون



بێ ئازار لە بارچوون
لە ساتەکانی مەست بوونیشدا
چەند هۆنراوەیەکی بەنگکێش سەریان هەڵدا
وشەکان دەبن بەترۆپکێ باڵاتر لە ئاسمان
قووڵتر لە خەونی دەریاکان
لەگەڵ شەپۆلی هارو
ڕێژنەی گەواڵە هەور
زامی ئایدۆلۆژیای سڕبوون
سارێژ دەکەن
وشەکان پەپوولەیەکن زامدار
ڕەنگ پەلکە زێڕینەیی
لەسەر چڵی
هیچ لاپەڕەیەکدا هەڵنانیشن
هەمیشە کۆچەرن
دنیا دەگەڕێن
لەلانەی ڕۆحدا
هەڵدەنیشنەوە
دەگەڵ غەمەکانم گەورە دەبن
شیعری بێناز چاو هەڵدێن،

جیاوازییەکان هەڵدەوەشێنەوە
تف و ماچ
دڕک و گوڵ
تاریک و ڕوون

کوێلەو ئازاد
سیخوڕو شۆڕشگێڕ
خۆشەویستی و کینە
هاوکێشە بەرەواژەکان
زلدوژمنی دیرۆکی ناتەبایی ڕۆحن،
کۆنفوشیۆس ببوورە
هەموو چراکانی دنیا ناتوانن
ژوورە تاریکەکانی ناخم
ڕۆشنکەنەوە
(من ژیانم مەرگێکی پلەیییە
لەم چاوەنواڕییە بێ هوودەیە...)

ناخ هەرەس و دامرکانەوە
ناخ دنیایەک حەسرەت و پووکانەوە،
خۆ من تەنێ کوێلەی ئەڤین و
شیعرە ئازادەکان نەیم
بەسەر تەرمی گەنیوی ڕابردوو ڕابوورم
پشت بکەمە یادەوەرییەکان...
کلیلی خەونەکان
قفڵی دەرگا داخراوەکانی ئایندە ناکەنەوە
کلیلەکان لە نێو قورگی ئەژدیهای زەمەنێکدا
بزر بوون
کەسێ نییە بیدۆزێتەوە!
کێ بێ بیدۆزێتەوە،



کێ دێ
منی نێچیر
لە نێو تەونی جاڵجاڵۆکەکان
دەرباز بکا
کێ بێ
منی بێ سەرو شوێن
لە نێو کەمینی پڕ لە مینی شەمشەمە کوێرەکان
ئازاد بکا
کێ دێ
کێ بێ...
کێ...
بێ. ؟!

بەهاری ١٩٩٢



## ئەهلی کەهف

سەراپا دنیا بەزەلکاو گیراوە

دەرو دەشت
کێو
بیابان
جەنگەڵ
دەریا



زەوی
ئاسمان

دەشتەکییەکان
کێوییەکان
بیابانییەکان
جەنگەڵییەکان
دەریاییەکان
زەوینییەکان
ئاسمانییەکان،

هەست
نەست
رۆح
ئالوودەی زەلکاون،

گیراوە بەزەلکاو دنیا سەراپا ،

ئەمە تۆفانی نوحە
یان زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆن،

کێوییەکان لە کێوان نامۆن
بیابانییەکان لە بیابان
جەنگەڵییەکان لە چڕە سێبەری درەخت
دەریاییەکان لە سەمای شێتانەی شەپۆل

سەر زەوینییەکان لە هەناسەی دوکەڵاوی زەوی

مەگەرنا
لەم زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆنە
خەراباتێک نابێ
ساقییەک نایێ
پێاڵەیەک مەی بهێنێ
تا لە نێو گۆمی مەندی بەدمەستیدا غەرق ببین

دەنا لەسەر تەرمی ژەهراوی عیشق
لەو هەڵدێرانە
لەو بیابانە وشکەڵانە
ئەو جەنگەڵە تاریکستانە
ئەو دەریا سەرشێتانە
ئەو سەرزەوییە ئالودەیە
خەون بەقووڵایی
بەچڕی
بەجیوەیی
بەئۆلۆمپیادی مێش و مەگەزەوە دەبینین.

هێستریای ئاسمانییەکانە لە ئاسمان
مێشک لە کەللەسەر
هەست لە نەست
ڕۆح لە جەستە



ئەمە تۆفانی نوحە
یان زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆن

مەل چریکەی بەدرەخت ناگەیەنێ
باران لە پێدەشت
بەفر لە باڵای کێو
لم، جەستەی بیابان

منیش
چاوم لە بینایی
دەستم گۆج
قاچم شەل
جەستەم هەڵپڕووکاو
لە نێو ئاتەشکەدەی گوناه و پەژیوانی
هەڵپڕووکاوم

سێبەرم،
سیخورە بەسەر جەستەم
دەنگ لە زمانم
ڕەنگم، لە پێستم
دڵم
ئەشکەوتی هەزار ڕاز و
قورگم هاواری عیشقێکی ناکامە.

شار،

شاشار
گۆڕستانە
گۆڕستانی زیندووانێ
کە لە ژێر چەکمەو قۆشەنی مارو مێروو
مەغۆلی بێ ئامانی مێش و مەگەز
تاج و تەختی بتەکان دەپارێزێ
هیستریای خواوەندەکان
بۆ نەسلە لە دایک نەبووەکان دەگێڕنەوە

م ن ی ش
لە نێو ئەم زەلکاوە بێ ئامانە
لانکی شەو
بێداری مندالّیم ڕادەژەنێ

خەونەکانم
لەسەر پێڵووی هەزاران شەوی دیکە ڕادەبرن
دوا بلّقی ئەم زەلکاوە
دەست لە خنۆکەم دەگرێ
چاوێک تێمدەڕوانێ
گۆرانییەک دەمسترێ
دەستێک بانگم دەکا
تا جریوە جریوی چۆلەکەی چاوەڕوانی
سەما بەجۆلانەی بەرەبەیان دەکەن

جگەرەیەک دەمکێشێ



هەناسەیەک هەڵمدەمژێ
لێوێک ڕامدەمووسێ
باوەشێک خەون گەرمم دەکەنەوە

ئەڤین دەمکوژێ

ئەی ڕۆحی نەفرین
کە هەمیشە بەدوو جاویدانی وێڵ بووی
لەو گەشتە بێهوودەیەی ژیان
کە بەوالّا بوونی دەروازەکانی مەحالّیش دوایی نایێ
بارانێک نەباری
ئەو ڕۆحە نەفرینە پاک کاتەوە
تا گڕی سووتێنەری دووری
نێوان چلێک لە درەختی نێو جەنگەڵی بەردینی عیشق
بکاتە مشتێ خۆڵەمێش،

بەبارتەقای دووری
نێوان ئاسمان و ڕێسمان
تەمی هەڵچووی پەژیوانی خۆی بنوێنێ،
بۆ تۆزقاڵێ سێبەر
لە نێو لەپی میهرینیدا
هێلانەیەک بۆ بێچووەکان
گەلاّ وەریوەکان
بکاتەوە
یان لە گۆشەی خانەقایەکدا





دەفی مردن بژەنێ
برینی جەستەی بزمار ڕێژکراوی سارێژ بکا

لە ژێر سێبەری گەڵاکانی ئاسوودەیی
پاش زەلکاوی چەرخی ئەلەکترۆن
ڕۆحی ماسییەک
ئەسپێک
هەڵۆیەک
یان درەختێک بێتە بەر،

منداڵی
خەون بەمنداڵیی خۆی ببینێ

زەلکاو
زەلکاو
زەلکاو

سەراپا بەزەلکاو گیراوە دنیا

هاوینی ٢٠٠٠



## من سەرابم

من هەتاوم خوێندەوە
تیشکەکانی بۆ دایساندم
سێبەر خۆی وەلانا
چارەنووسم بە قەدەر سپارد
هۆش بە خەیاڵ
هەستم بە نەست



من ڕۆناکیم خوێندەوە
تاریکی خۆی کوژاندەوە
تاریکیش نەبوو فووم لە چراکان کرد،

ئای گەشبینی کۆتایی چیرۆکەکان
هیوای عاشقە ساویلکەکانە،
ڕەنگە منیش وابم
ئەگینا چما نەمدەزانی
لە سەردەمی گەل و نیشتمان و لەش فرۆشتن
دەبم بەهاوەڵی دیوارەکان
دیوارەکانی باوەڕ
دیواری خەڵک
دیواری ئەڤین،

من ڕێی نزیکم خوێندەوە
دووری نەفرینی لە خۆی کرد
کەچی قەدەر ڕێیەکی بزر بوو
خەیاڵیش مەست،
نەست گرێی بیرکردنەوەیەکی لێکترازاو
مێشکم بەچیمەنتۆ سواغ دا
دەفتەری هەستم دڕاند
قەڵەمەکانی بیرم شکاند،

ئەڤین ڕەگی قووڵی درەختێ بوو
لە ناخی من

لە بنجەوە خۆی هەڵکەنی
من لە گەڵاکانم ڕووت کردەوە،
گەڵای زەردی وەریوی درەختیشم خوێندەوە
سەوزتر بوو لە سیمای ڕەنگاو ڕەنگی،

کەنارێک بوو
لە رووباری خوێنی من جویێ بووەوە

شەپۆلی هاری ڕووباریشم خوێندەوە
هێمن تر بوو لە گێژەلووکەی ناخی،

لووتکەیەک بوو
لە کێوی بەرزی هەستما ڕووخا
من دڵی تاشەبەردم خوێندەوە
گلێنە بوو،
لە چاوەکانما چی نەبینی
ڕۆح بوو لە جەستەمدا

من ژیانم خوێندەوە

ڕەنگی پەپوولەیەک بوو
پەلکە زێڕینە ئاسا
بەسەر گوڵە نایلۆنەکان هەڵنیشت،
ئەشکی شەونم و
گەوالەم خوێندەوە،



ئەڵقە نەبوو
کۆتی ڕۆژگارێکی نامۆ بوو
لە دەستم
گوللەیەک بوو بۆ نیشانی دڵم
خەونێکی سادەبوو
نازانم بۆ
بەئالۆزی شی کرایەوە
کەچی سەرگەردانی درەنگ واگای هێنام،
مەستی هەمیشەیی پیاڵەیەک ژەهر بوو
نۆشیم
تێکەڵ بوو بەدەمارەکانم،

ئەو بێزاری بوو
لە بێزاری نیگای گومانی هەزار بارە بووەکان
لە نیگەرانی چرکەی سەعاتی ژوورەکەم
لە ناونیشانی کتێبەکان
لە گەداو شێت و بۆیاخچی و جگەرەفرۆش و
سەر فرۆشەکان،

بێزاری بوو لە بێزاری
خەنجەر لە کاڵانەکەی
قوربانی لە جەللاد
هاوارێکی تووڕە بوو
لە ئاست بێدەنگی ئاوێنەکان

سەرگەردانی جادە
کە هەنگاوەکان ناناسێتەوە
لە زمانی ئەو چاوانەی درۆ دەکەن،

نازانم من خۆم خەڵەتاند یا زەمانە فریوی دام
ڕەنگە لە ئەزەلەوە بوون هەڵەیەک بوو بێ
سروشت دووبارەی نەکاتەوە
یاخود تاوانێک بێ
ڕۆژگار پەژیوان بکاتەوە

ڕەنگە گوناهی گەورەی ئێمە
حەژمەتی فرمێسکی ئەو ئەستێرانە بێ
کە لەمیان بوولێل و کازێوەدا
سۆمای چاویان لێکناو ئاوابوون
ڕەنگە گوناهی ئێمە
تۆرانی تریفەی مانگ
ڕەنگ زەردی خۆرەتاو
شەرمی خۆراوا بوون
نیگەرانی شەوەزەنگ
تووڕەیی گێژەلووکە
یاخی بوونی شنەبا
چاوەنواڕی بێهوودەیی وێستگەکان
یان هەنیەی شەکەتی شەقامەکان
یان نەفرەتی ئەو شووشە بەتاڵانەبێ



کە سەرمەستانە جێمان هێشتن

ڕەنگە گوناهی گەورەمان
زەردەخەنەی تۆراوی سروە بێ
کە لەوەنەوزی بن سێبەری ئامێزی ژوان
لە تاریکی کۆڵانە تەنگەکاندا
جێ مابێ،
یان حەسرەتی ئەو شیعرە سەرشێتانە بێ
کە نازانم بۆ خۆشم نەویستن.

ئەی بەرد بدوێ
کێ بەقەد من هانای بۆ هێناوی
مەگەر تەنێ فەرهادی بێستوون
کێوی چاوەڕوانی بکێڵێ
یان برایم
لە زمانی گڕگرتووی من بگا
وەک من چیرۆکی تاڵ و درێژی
عیشقێکی نەفرینی بۆ گێڕاوی
ئاخر
من دڵی تاشەبەردیشم خوێندەوە
نەرمتر بوو لە دڵە بەردینەکەی.

بەرد لە حەژمەت ئازاری من
جوولایەوە
شەقی برد

کەوتە گریان
کەچی بووکە شووشە بێ گیان بوو
نەهاتە دوان،
دیاربوو من ئەڤینم نەخوێندەوە
من سەرابم خوێندەوە
من سەرابم...

بەهاری ١٩٩٤



## راسپاردەی خەونبینێک

خەون نەبوو
ورێنەی تەلەسمی زستانێکی
ساردو سڕبوو
کۆچی تۆفانی شەوێکی تووش و
بێ کۆتایی
شەوی سووتانی برایم
ڕاکشانی بوودا



ڕۆحی خودا
لەسەر شمشێربوو،
ساتە وەختی چاوەنواڕی
گڕ تێپەڕ بوونی شیعرێک بوو،

شەو ڕەهۆڵی زیندانێکە
نهێنی، تەنیایی جەللادێکی خەوتوو
خەون نەبوو،
ڕۆحی شیرینی بەرخێکی
سەر بڕاو بووم
بەسەر لاشەی
لە خوێن گەوزیوی خۆمدا هەڵکورمابووم
لە زەماوەندی قوربانیدا
پێستی خۆم داماڵی
ئەوەتا نێچیرێکم
دەستەمۆ
خوێنم مۆری پاساپۆرتێکی قەڵپە
کەللە سەرم
باجی پەڕینەوەی ڕێی
قاچاغی (ئا) و (نا)یە
خەوی نەزۆکی شووشەیێ حەبی ڤالیۆمم
قەڵەمەکەم لە پرسەی
ئەو شیعرە سەرگەردانەن
کە لە دەلاقەی دیوارە ڕووخاوەکانی هزردا

له نێو دەفتەری بیرەوەرییەکان
بەهەتیوی مابوونەوە

شەوان بوورین
هەر نەهات
ڕۆژان بوورین
هەر نەهات
وەرزەکان
ساڵەکان
بەچاو ترووکانێک تێپەڕین
عومری نامۆیی
گوڵان ئاسا
پەڕ پەڕ هەڵوەرین
ژوانگەکان لێک ترازان،

ئەمە ئەفسانەی قات و قڕی و بێ ورەیییە
نە پێشەکی
نەکۆتایی ئازارەکانە
نە نووزانەوەی مەرگی وشە باڵدارەکانە،

مەرگ تەتەرێکە
سواری ئەسپی گەشتی مەحاڵە
ئاسمان و ڕێسمان
بەرەو نەبوون ڕادەپێچێ
گووفەکە خاپوورەکان



دەبنە کۆشکی بلوورین
شازادەی مێشک پووچەڵ
تاجی زێڕین لەسەر  دەکا
کەللە سەری پووکاو
عەرشی پەیکەرە ئێسکی دێرینی گۆڕستانە،

دنیا فنجانێکی سەرەو نگونە
پڕە لە نەخش و نیگاری بێ مانای پڕ و پووچ
پیرە قەرەجێک
بەگەشبینییەکی درۆزنانە
بەشیکردنەوەیەکی نێرەمووکانە
خەونەکان دەگێڕێتەوە:

شەو قەفەسێکی ئاسنینە
خۆریش کۆترێکی دیل
تووڕ هەڵدرابووە نێو کونجێکی تاریکەوە
بەپەڕەی تیشکەکانی
گڕی نەمری دەپرژاندە نێو ئەشکەوتی نهێنی
ئەو چاوانەی هەمیشە بێدارن،

پەیکەرە بەردینەکان دێنە جوولە
جارێکی تر شەو بەدەستی خۆرەوە بارمتە بوو
ئێمەش ماڵاواییمان کرد...
بەهەناسەیەکی ساردو کرنۆشێکی بوودییانە
نیگامان لەو ستێرانە کرد

کە خەونی منداڵییان لێ دزین
نوێژمان بۆ خۆڵەمێشی ئەو خاکە کرد
کە لە ئەڤینی خۆی بێ بەشی کردین،
ئالودە بووین بەو دوکەڵەی
کە دەمامکی ڕەنگاو ڕەنگی ڕۆژگارێک بوو نامۆتر
لە سیمای منداڵێکی ساوا...

من بووم تەمێکی سەرکەش و
ڕوەو باڵای هەورەکان هەڵکشام،
– ئەمە خەونی تراژیدی
دوا لاپەڕەی داستانێکی قاچاغ بوو
پەیڤەکان
ناخوێنرێنەوە
نابینرێن،
خەفیەکان
ماڵ بەماڵ
کۆڵان بەکۆڵان
لە دەشت، لە چیا ، زیندان
تەنانەت بست بەبستی گۆڕستانەکان
بۆم دەگەڕێن...

من نازانم کەی دەمرم
ئەمە بڕیاری پیاڵە ژەهرێکی شیرینە
زایەڵەی دەنگی گوللەیەکی سەر شێتە



بەڵام کۆتاییەکانم
سەرەتای شێت بوونن
سەرەتای هەڵاتنن
سەرەتای خۆکوشتنن!

زستانی ١٩٩٢



## سیمای ژەنگەکان

بێ ورە
لەم گەشتە بێهوودەیەی ژیان
زەمەن سەرگەردانی تراویلکەی ئەوینێکە
هەر چەندە ڕادەبرێ
بەسێبەری هەنگاوەکان ناگا،
گەڕان...
بزربوونە لە نێو سیمای تەڵخی ئاوێنەکان



ئاوێنە گەورەکانی منداڵی
ئاوێنە چکۆڵەکانی پیری،

نامۆم... لە بوونی خۆم
لە نەبوونی ئێوە،
خوڕەی باران لە هەورەکان
شەپۆل لە شێنەیی ڕەوتی ڕووبار
تیشک لە سووتانی خۆی
ماندوویەتی جادە لە خەوتنی سەر شۆستەکان
یاخیی لووتکە لە هەڵدێری کێو
درەخت لە سەمای مەرگی گەڵاکان،

نە خۆم دەناسمەوە
نە ئێوەش دەمناسنەوە
بەم خۆرەتاوە، لە نێو تاریکی هەنگاو دەنێم
لە نێو تاریکی چاو لێکدەنێم
ناڵەی ئەو درەختە سەر بڕاوەم
ڕەگەکانم کۆت و
گەڵاکانم کفن،
ساڵەهایە لە نێو جەنگەڵی خۆڵەمێشی خەونەکان
پرچی گەڵا زەردەکانم دەڕنمەوە
داستانی مەرگی چۆلەکە ئاوارەکان
بۆ شەپۆل و خوڕەی باران دەگێڕمەوە
لە ژێر سێبەری گومانی سبەی

هاواری سوارێکی بریندارم
بەجێماو
لە جەنگێکی ئەزەلیدا
سەرمەستانە
شەرابی ژەهرینی پەژیوانی دوێنێم دەنۆشم
کەللە سەری براوی مێژووم
دەکەمە پەرچەمی خەونەکان
خەونەکانم، نەفرەتی شیعرێک بوون
خەونی
ئەوانەی بەنێو تاریکیدا ڕۆیشتن
ڕوەو خۆر سەریان هەڵگرت
پشتیان لە درەختی سەر براو و
کەلاوەی شار کرد
نەیانویست پشت لە مەرگی پەپوولەکان بکەن

لە نێو گێژەلووکەی نەفرەت و نوغرۆ بوون
گەمییەکی سەر لێشێواو بوون،
وامدەزانی دنیا پەنجەرەیەکی والایە
دڵە شووشەکەم چوارچێوەکەی
ژیان گۆرانی بێ کۆتایی منداڵی و
جربوەی چۆلەکەکانە
چیرۆکی خەونی عاشقان و
هەناسەی ژێی شنەبایە
ئامێزبشمان لانەی گوڵ و پەپوولەکان



مەلێکی مشەخت بووم
پەڕوباڵ لە گڕ
لانەم کوانوو
نیازم بوو بەرەو ڕەهایی هەڵفڕم
گڕ لە ئەستێرەکان بەر بدەم
بیکەم بەبارستەیەک خۆڵەمێش
بەنێو گەردو غوباری نیگەرانی
ئەو ژیانەی پەرت کەمەوە،
ئاسمان، بیابانێکی ڕووتەڵان بوو
لەبەردەم ڕۆشنایی چرای هزردا
مینا جەستەی لەرزیوی بووکێکی تازە یەکشەوە
هەڵدەکورما،
زەمین زاوایەکی خەساو
لە شەختە بەندی نیگەرانیدا
دوا گڕی ساتەکانی نائومێدی دادەسێنێ،
ئاینده سەراب ئاسا
نیگەرانی نێچیرێکی نامۆیە
لە نێو کەڵبەی گورگی بیاباندا دەناڵێنێ

دنیا پەنجەرەیەکی والا نەبوو
نە خوڕەی باران بوو بەگۆرانی
نە برووسکە چەتر،

پەپوولە لە کۆچی سروە

درەخت لە وەرینی گەڵاکان
ڕووبار لە ناڵینی شەپۆل
کەنار لە مەرگی زەرییەکان
گۆڕستان لە بەسەرهاتی بێ ناسنامەی کێل و
تۆماری مەرگی زێوان دەدوێ،

ڕێیە نزیک و دوورەکان
تێکەڵ دەبنەوە
داوە باریک و ئەستوورەکان
گرێ دەدرێنەوە
مەنزل، مار ئاسا کاژ دادەماڵێ
ڕەنگەکان
دەبنە هەناسەی
شەوێکی کپی نێو کۆڵانێکی بن بەست،

نزیک بوونەوە
ماچی چزووی ژەهرە
دووری ڕێیە لێکترازاوەکان
دەسرێژی شەونخوونی ڕێبوارێکی جێماوی
دوا وێستگەی سپێدەیە...
بەمردوویی لە جادەکان جێدەمینێ
کەسێ نایێ بەهانای بێ
فرمێسکێکی بۆ هەڵڕێژێ
تاخوڕەی باران ببێ بەگۆرانی



برووسکە چەتر،

لەو گەردوونە سەمەرەیە
گەردێکی چکۆڵەین و
تادێ خورتر دەبینەوە
لە خواو خودو سروشت و مەرگی خۆمان،

تراویلکەی بیابان
لە شێت بوونی قەیس
ترۆپکی زامە هەڵکۆڵراوەکانی بێستوون
لە ئازاری تەوشەکەی فەرهاد
تاجە خۆرەتاوەکەی ئاسمان
لە مێشکی مۆمیاکراوی کەللە سەرێکی بەتاڵ...

بەر لەو چیرۆکانەش ئازارێک بووین
برین پردی پەڕینەوەی هەنگاوی هەڵدێرێک بوو
ڕێگا بزر بووەکان ڕووەو هەورازو نشێوبوون،

لە کۆشکی کاغەزی خەیاڵدا
ئەڤین عەرشی سەرابە...

هزرەکان ڕەوە داڵێکن
بە نێو تارماییەکان هەڵدەفڕن،

ئێمە هێشتا سروودی ناوازەی ئاوابوونین
دوا چیرۆکی شەوێکی دیکەی ماڵاوایی دەچڕین،

سەردەم چاوی خەوتووی پشیلەیەکە
کارەساتەکان نێچیرێکی دەستەمۆن،

دڵم بەپەپوولە سپارد
تافێری ئەڤینی گوڵ و سووتان و
شەوانی
تەنهایی بکات
کەچی پەپوولە زادەی قوڕبوو
گوڵیش، نایلۆن

موغانێک بووم
لە کونجە تاریکەکانی مێژوو
نزام بۆ دارمانی پەرستگاو
نوێژی بەسەرچووی عیشق کرد،

سەر هەڵبڕە لە هەر کونجێکی ئەم زەمینە جەنجاڵە
مەندی زەلکاوێکی پڕ نهێنی سەر دەردەکات
سەردەم دوکەڵێکی ڕەشە
ڕەشتر لە چاوی شەو
دارستانێکی وشکە،
وشکتر لە قوڕگی بیابان

وامزانی دنیا پەنجەرەیەکی والایە
لە تێنوویەتیم بارانی میهر
بەسەر درەختی وشک بووی ڕۆحمدا دەبارێنێ



من کە بوونم نۆشینی بادەیەک هەنگوینی تاڵ
نەبوونم هەڵمژینی بۆنی گوڵێکی ژەهراوی
لەمیان بوون و نەبووندا
خزیمە نێو بازنەیەکی بەتاڵ،

کۆچم دوا کۆچی بەدوو هاتووی سەفەرێک بوو
هەنگاو، سۆراغی بەشوێن هاتووی ژوانی مەرگە
لە نێو کانی هەنگوینی چاوی زارۆڵاندا
بۆ ناونیشانی گۆڕستانێ دەگەڕێم
گۆڕ هەڵکەن خۆمم
بۆ خۆیشم تەرمی خۆمم بەکۆڵدا داوە،

کراسی تەمم پۆشیوە
لە نێو کوانووی گڕدا
سەما دەکەم
گەمی تێکشکاوی ئەو گەشتە بێ چارەنووسەم
شەپۆلی گڕی کۆچێکی سوورم لە ئامێز گرتووە
بەهەزاران
بەهەورازو نشێودا ڕابووریوم
تخووبەکان لەبەردەم گێژەلووکەی کۆچی
وەرزە شوومەکان
پەرت بوونەوە
برینەکان دەبنە گلێنەی هەزاران چاوی گەش
بەپشتی کۆماوی ئەسپی گلاوی زەمانەدا

بەشمشێری شکاوی جەنگێکی بێ کۆتایی
لە نێو ئاوێنەی درز بردووی چاوی شاری کوێران
چاوم هەڵهێنایەوە
بەسەر ترۆپکی زامەکاندا
هەڵگەڕام
بەسەر کێوی سەختی ئازارەکان
هەڵشاخام
پەنجەرە داخراوەکەی دنیام والاکردەوە،
(ئای دنیا چەند گەورەیە
ژیان چ وەهمێکی ڕەنگاو ڕەنگە)

١٩٩٤



## نێوانەکانی تر...

بۆ زامەکانی ئازاد سوبحی

سۆمای ئاوێنەکان
لە فرمێسکی زیوینی ئەستێرەکاندا ڕەنگ نادەنەوە
ئەو گۆرانییانەی لەسەر لێوی دوێنێی
منداڵیمان
هەڵدەقوڵان



ئەمرۆ دەنگی کپی ژوورە داخراوەکانی ناخمان ناناسنەوە
ئێمە لە وەتەی هەین
لە نێو گێژەلووکەی ڕق و بێ بەزەیی
چاو هەڵدێنین
لەبەردەم ڕێژنە بارانی غەمەکاندا تەڕ دەبین
ڕۆحی ژەنگاویمان دەشۆینەوە،

ئای چەند سەختە
لە نێوان دیوارو تراویلکەدا
هەنگاو دەنێین
لە نێوان بێشکەو کێل
قیژەیەکی یاخین
بێ هەناسە چاو لێک دەنێین،

تۆ خەون بووی...
بەڵام لە سەردەمی قوربانی و
کۆچی ئەبەدی نەگەڕانەوەی
پێغەمبەرەکان
خوێنی چۆڕاوی شەهید بوونمان
زامی سارێژ نەبووی مەسیحی چاوەڕێیە
دڵنیابە
گوڵ لەسەر تیغی خەنجەر ناڕوێ
کابووسێکی هەمیشەییە
بەری سۆمای ئاوێنە درز بردووەکانی ناخمانی گرتووە

گرێی ئەفسانەیەکی پڕ نهێنییە
مینا خۆرێکی ئاوابوو
لە شەوە دەیجوورەکاندا، هەڵدێتەوە
عیشق کینەی خەنجەرێکی ژەهراوی درۆزنەکان بوو
نەفرین لە کالانە ژەنگ گرتووەکەی دەکا،

ئای چەند سەختە
لە نێوان ئەڤین و مەرگێکی تر
لە نێوان دۆزەخ و دۆزەخێکی تر
چاو هەڵدەنێین
چاو لێک دەنێین
بۆ هەمیشەیی لەبەردەم ڕێژنە بارانی غەمەکاندا
تەڕ دەبین و
ڕۆحی شەکەتمان دەشۆینەوە

پاییزی ١٩٩٣



## بێوار

وێرانە شاری نغرۆ
دالّدەمان بوو
بەرەبەیان
خۆرەتاو تاجە زێڕینەکەی
تووڕ هەڵدایە سەر نوێلکی کەلاوەکان
سروشت
لەبەردەم مەرامی شەو و شەهوەت



ڕووت بووەوە
پەڕەسێلکە کۆچەرە بێوارەکانیش
لانە وێرانی شاری نغرۆیان جێ هێشت
ڕوەو گەواڵە گرژەکان
سەری نامۆییان هەڵبڕی
لە ئاست عەرشی ئازارەکانیان
کرنۆشیان برد
بۆ تاجە بزرەکەی خۆرەتاو
نەفرینیان کرد
لە تەلاری بڵندی خەونی ڕەنگاو ڕەنگی
عاشقە کۆیلەکان،
دواتر
دوای ڕمانی کێوە سەختەکانی نیگەرانی
توانەوەی زەردەخەنە سڕبووەکانی نەست
دامرکانی شەپۆلی خرۆشاوی
دەریای قووڵی خەونەکان
تێکەڵ بووینەوە
بەو تەمەی کە هەناسەی بیرەوەری
ژوانەکانی لێ هەڵدەچوو
لە نێو هێرشی باو بۆرانی لێکدابڕانی ساتەکان
تەنێ گۆشەگیری دالّدەمان بوو
شەوە درێژەکانی چاوەنواڕی
گۆڕستانی خەون و

ئەفسانەی ئەڤینی
دڵێکی ئاسنین بوون.
تەرمی بێ شوێنەواری
جەستەیەکی شەکەت بوون
لە وەرزی سەرهەڵدانی ئەڤین و مەرگدا
نهێنییەکانی بوون و نەبوونی
ئاشکرا کرد،

بەڵام من لە وەتەی هەم
ئازارێکم بێ ڕەگ
بەسەرگەردانی وێڵم بۆ تراویلکەیەک
گومان دەچێنم
گومان
گومان
گومان

من هەم یا نیم
بیابانێکی تینووم
لەبەردەم تریشقەی سۆزو تاوان
گوناهەکانم دەشۆمەوە
لە میان بولێل و کازێوەدا
بەسەرسامی لە پێڵووی چاوی بێداری
وێرانە شاری نغرۆ ڕادەمێنم



شەو، سەگێکی لاڵە
هۆش، دیوارێکی تەپیو
هەست، پولەکی چرایەکی کز
بیستنم، سەدای ڕمانی تاشە بەردی کەڕی
سەر ڕێگاکانە،

ئێوارە درەنگان
ڕۆژ ڕادەبرێ
بەزنجیری پرچە پەرش و بڵاوەکەی
دەست و پێی شەکەتی شەقامەکانی شار گرێ دەدا
دەگەڵ پەرەسێلکە بێوارەکان
وێرانە
شاری
نغرۆ
جێ دەهێڵێن

بەهاری ١٩٩٣



؟

نهێنی خەونەکان
پێشبینی فریشتەکان نەبوون
فریشتەکان
کرنۆش نابەن بۆ پووکانەوە هەورە میتاڵییەکان
فریشتەکان
لە بیابان بوونی کێو
وشک بوونی شەپۆل



پێک نەگەیشتنی کەنار
گیان دەسپێرن
جاویدانە
لە نێو بازنەی سەمای مەرگێکی دەروێشانە
زیندوو دەبنەوە
دیواریش تراویلکەی هەیە!
ئەگەر نا بۆ کلیلەکانی ڕێگەی بن بەستی
کۆلانەکانی چاوەنواڕی بزر دەبن
ئێمەش لە هەر هەنگاوێک
سەرەڕۆیانە بزر دەبین
بەبێ دەنگی لەم پەرستگا خەڵوەتییە
لەسەر مینبەری زامەکانمان ڕادەکشێین
خوێنی چۆڕاومان دەبێتە تەم
بناری ئازارەکانی گۆشەگیریمان داگیر دەکات

ئەوە منم...
لە نێو سیحری عیشقێکی بەتاڵ بوودا
شووشەی ڕۆحم شکاوە!
بوومەتە حەکایەتی
ئەفسانە بێ کۆتاییەکان
هەزاران لێو دەمگێڕنەوە
هەزاران چاو دەمبینن
بەنامۆیی لە نێوان تارمایی دوو دەستی ڕەش
تەرمێکی زیندوو لە کۆڵ دەگرم

بەنێو جەنگەڵی ڕیایی زەمانە تێ دەپەڕم
شەلالی خوێن
لانەی هەڵپڕووکاوی جەستە شەکەتەکەم ڕادەماڵێ
لە نێو تەنێییمدا غەرق دەبم...
تۆش دەبیتە کۆترێک پەڕو باڵ لە گڕ
لە شەقەی باڵ دەدەی و بەر هەڵدا دەبی
لەسەر  هەورەکان هەڵدەنیشی
لە نەخشەی زامە قووڵەکانم ڕادەمینێی
لە نێو قەفەسی دڕکبەندکراوی دڵە دیلەکەم دەنیشیتەوە،

مەتەڵەکانی ژیان
شی دەکەیەوە
عیشق
درۆیەک بوو
کتێبەکان فێریان کردین
عیشق ڕێبوارێکی قاچاغ بوو
بۆ هەمیشەیی سواری کەشتی گەشتێکی مەحاڵە
بەر لە ئالۆزبوونی ڕەگەکانی نەست
لێکترازانی ڕەنگەکانی وجود
کۆچی تیشکە شکاوەکانی خۆراوا بوون
دوا بۆشایی
لەسەر پەڕەی دڕاوی دڵی زەمەن
پڕ دەکەیتەوە
دوا پرسیار



لەسەر دەفتەری ئەزموونی عاشقە دۆڕاوەکان
فریشتە تۆراوەکان
جێ دەهێڵێن...

پاییزی ١٩٩٣



## دوورگەی وەهم

سەرم ژوورێکی ئاپۆرەیە
خەیاڵ خانەخوێ
هزر مێوان
چاوەکانی ڕوانین بێدار

شەونییە سەرم لە جەستەم جوێ نەبێتەوە
لە گەشتێکی جاویدانە



لە نێو بێشکەی خەونی قووڵی منداڵی
بێ ئەوەی بلیتی مەرگ ببڕێ
خەونێکی هەنگوینی دەبیاتەوە،
لە شانەی هەنگی خەونەکانیش
هەنگ مارەو
هەنگوین ژەهر...

لە نێو دوورگەی وەهمێکدایە
ماڵی من
ماڵی خەون و ئەفسانەیە،

مانگ لە نێو تەلاری شووشەیی خۆی
بەرد باران دەکرێ
لە پرسەی سەرەمەرگدا
بەرگی تریفەیی والا دەکا
لە نهێنی ئاوابوونی خۆی دەدوێ،
لەوێ خۆرەتاو بێ هەودا
خوێنی لێ دەچۆڕێ
ئەویش لە پرسەی شەوەکاندا
تیشکەکانی دەڕنێتەوە
گەواڵە، فرمێسکێکی بەخوڕە
کێڵگەی زەردەخەنەش
گیایەکی سیس و پوکاوە،

چ خەونێکە لە نێو تاریکی دا وەنەوز دەدەین

وێڕاش ناگەین خەونە کوژراوەکان
بەپەپوولە فیرارەکان بسپێرین،

منم گۆڕەوان و بەر لە هەر مردنێکم
بەدەستی خۆم کفن بۆ خۆم دەپۆشم
لە نێو باخی وشک بووی چڵە درەختەکانی زەمەندا
لە خوناوی دڵشکاوی گەڵا وەریوەکان ڕادەمێنم
لە هەر ڕوانینێک
ڕووبارێک ئەشک
دەڕژێنمە نێو بیابانی سەرابیی
ئازاری بێ دەنگی دوورگەی غەریبیم،

مێوەی شیرینی ڕۆحی من بوو
بەری سێبەری درەختە سەوزەکان
لە پێشوازی نوتەکی هەر شەبەیخونێکدا
چەنگی پەنهانی مۆتەکەیێ دێ
بەردی ڕقێکی لێ دەگرێ

من دەگەڵ سەفەری هەڵچوونی شەپۆل
نهێنی تووڕەبوونی تۆفان
ڕۆ چوومە نێو دەریای قووڵی ئەندێشە
لە ڕازی قووڵاییبیەکانی ئاو
یاداشتی قوماری کەشتیبیەوان و
کۆچی نەگەڕانەوەی کەشتییە تێکشکاوەکەی
یاداشتی مردنی ماسیگرو



بزربوونی قولاّبیەکەی
یاداشتی سەرکەوتنی ئاو بەسەر تەرمی لم
یاداشتی خۆکوشتنی بەکۆمەڵی ماسییەکان
ڕێبوارەکان غەرق دەبم،

جەستەیەکم لە سەری خۆم جوێ بوومەتەوە
دەستەکانم ئاشنای یەکدی نین
لاقەکانم لە یەک دابڕاون
نێچیری نێو کەڵبەی ئەژدیهایەکم
سەرێکی بایەو هاواری من
هاواری وشکی قورگێکە
هەرچی ڕەگی پەیڤە بنبڕکراوە
سەرێکی ئاگرەو پشکۆی ڕوناهی
لە بینایی چاوەکان دەکوژێتەوە
سەرچۆپی زەماوەندی دۆزەخ دەگرێ
سەرێکی خۆڵەو لە نێو گۆڕی تەنگی بێ ئومێدی
کۆچی بێهوودەیی ساتەکان
لە پەراوێزی تۆمارنامەی وەرزەکاندا
بەگەرد و غوباری زەمەن دادەپۆشێ
سەرێکی دیکەش ئاوە
کەچی هەرچی ئاوە تێنوو
قورگی کەنار وشک
مەمکی گوڵە گەنمەکانیش
برسی...

بێداری چاوێکی شەکەتە بێ دەنگی من
بەهەزاران زمان لە پەیڤین دایە(*)
ڕەنگی من، فوارەی خوێنی چۆڕاوی
جەستەیەکی بریندارە
لە ناکامی جەنگێکی ئەزەلیدا هەڵقولاَ

من لە نێو دوورگەیەکدا جێمام
قەڵای بەرەڤانی وەهم و
ڕووگەی نزای دەرۆزەیە
قەڵەمی شکاوی مێژوونووسێکە
مێژووی مردوو شۆرو
مردوونێژە
تەنێ چاوە نابیناکان دەنووسێتەوە

تیغی زمانێکە
خۆی لە برینەکان دەسوێ
تەوری دەستێکی ڕەشە
ڕۆژ نییە درەختی ڕۆحی خودا نەبڕێتەوە
شیتەڵی نەخشەی فنجانێکە
قەدەر بەختی خۆی لێ دەگرێتەوە،

شەپۆلی یادێکی تۆراوبوو دوورگەکەی من

(*) دێڕە شیعرێکی ئەحمەدی شاملّویە لە کۆ شیعری (سکوت سر شار از ناگفته هاست.)



کەناری خۆشەویستی منداڵانەی جێنەهێشت
ژانی گەردەلوولێکی تووڕەبوو
لە بیابانی سەرابیی سەردەمێکی نەفریندا
هەڵی کرد
ئەفسوس
مەزدا کرنوشی برد بۆ ئەهریمەن،

ئاسمان بن میچی ماڵەکەمە
بستێ زەوی بۆ سێبەر وێڵە
تا شوێن هەنگاوەکانی بدۆزێتەوە
لە هەواڵی وێستگەکانی ناخی بپرسێ،

ماڵی من، گەواڵە هێلانەی تێدەنا
پەلکە زێڕینە ڕۆناهی چراخان بوو
دیوارەکان دەبوونە باخچە
بەردەکان گوڵیان لێ دەپشکوا
ئاسمان،
بێترووسکایی
دەروون خامۆش
نەجێی هەڵکردنی کۆلارەیەک
گەمەی پێشبڕکێی پەڕەسێلکەیەک
کشانی ئەستێرەیەکی لێ دەبێتەوە

بەرەبەیان، جریوەی چۆلەکەیەکی نامۆبوو
بەسەر لێوی درەختەکانەوە

ئیدی
پەیڤەکان، جوان ناکەنەوە
سیمای کرێتی وێنە بێ گیانەکان
عیشق، سەرچاوە کوێر
زیخەڵانی ژانێکی پڕئازارە
لەسەر ڕووبەری دڵە ئاسنینەکان هەڵنانیشێ،

لە نێو کەشتییەکی وێڵێن ئێمە
گێژەن، کەشتیوانێکی سەر شێتە
بۆ نێو دەریای گومانێکی بێ ئامان لێ دەخوڕێ
شەپۆل، گڕکان
کەنار بەمین چێنراو
ڕووەو وەهمێک سەرمان هەڵگرتووە
ناشزانین
ئاخۆ کەنگێ
چارەنووس بەتۆفان دەسپێرین!

تەموزی ١٩٩٥



## تێڕامان

بەڕایی ماسک بوو
ڕووپۆشی ڕوخساری
بەبرین داپۆشراوی سڕو
ئاڵۆزی و
پەنهانییەکانی
واڵا دەکرد،



سروشت...
هەر سروشتەکەی جاران بوو
ئێمە ئاڵۆزتر و
شەکەتتر و
بێهودەتر.

لە هەنیەی گەرد لێنیشتووی زەمانەدا
زمانی شنەبا بووین
باڵی بەستراوی خۆرەتاومان بەرهەڵداکرد
بارانیش بەخوڕ باری
ئێمە گوناهەکانمان
بەسێلاوی ئاوی باران نەسپارد،
(لالّی چەندین ساڵەم هاتە زمان...)
لە سەردەمی دڕکەڵانی بێ دەنگیدا
بەزمانی جریوەی مەلە کۆچەرییەکان
گۆرانیم گوت
لە ئەزموونی ئەفسانەی عیشقەکانیش
فێربووم سیامەند ئاسا بەعیشقەوە بمرم و
عیشق بسپێرم
بەسپێتی بەفر
گەرمی خۆرەتاو
تەڕی باران.

لەو شەوە نووتەکانە

بەگەڵ هەڵاتنی خۆرەتاو کەوتم
ڕۆحی ماندووم
مینا تۆپەڵێک قوڕ
بێ گیان
لەسەر کەناری ئاوە لێڵەکاندا پەرت بووەوە
نامەکانی یادەوەری منداڵیم
لە نێو قووڵایی ئاوەکان جێ هێشت
بەشەپۆلەکانی سەفەری نەگەڕانەوەم سپارد
(ئەمێستاش لە نێو گێژەنی زەمەنێکی نەفریندا
بێباکانە بەرەو فەنا ڕایدەماڵێ).

من بووم کوڕی گوناه و
لەسەر دەستی فریشتە سپی پۆشەکان
سوێندی پەژیوانیم خوارد و
دوا نوێژم لەسەر جەستەی سڕبووی تەرمی دوێنێم کرد
لە نێو ئاگرستانی پەژیوانی بوومە خۆڵەمێش
(خوایە چ ئاگرێکی خۆشە...)
دگوردەکانم بۆ ئاسمان هەڵدایەوە
نەبادا ئیدی بەبۆنی گۆڵە وەریوەکانی بەهەشت
مەست بم
چاوەڕێ بم هەناسەم
ببێتە تەمێکی سەراپا ڕەش
بەسەر سێبەرە سپییەکانی ئاویلکەداندا بێتە خوارێ



پەژیوان بە
لەو ماڵانەی لە پەڕەی هەڵوەریوی باڵندە تاراوەکانت
چێکرد
پەژیوان بە لەو هێلانانەی بۆ بێچووەکانت
جێ هێشت
لە پشت دەروازەکانی چاوەڕوانی
سروودت بۆ بێ دەنگی تاشە بەرد بوونت چڕی
بەڕووی ڕوخساری بەبرین دەمامکداری زەمانە
قەتماغەی زامەکانت هەڵکەنەو
لە نێو تابووتی وەهمەکان سەرهەڵبڕە
عیشقت وەهم بوو
ژیان وەهم...
تەنها مردن هەقیقەتێکی ڕەها

ئیدی ببرەوەریم...
جەستەی قڵیشاوی درەختێکی کرماوییە
ڕەشبینیم نەفریننامەی زەمەنێکە
بەژەهری کینەی خواوەندەکان ئاخنراوە
لە جەنگێکی سەراپا دۆڕاودا
بەرگەکان لە تەم و مژی سەرگەردانی
چەکەکان لە گەردو غوباری تەسلیم بوون
سەنگەرەکان لە تۆڵە و وتوڕەیی
ڕۆحی ماندووشم
لە جەستەی پڕ حەسرەت بێ ئومێدی،

بەر لە مردنیش
بەشێنەیی
لەسەر تەپۆڵکی ئاوی کانیلەیەکدا
باوەش بۆ سەمای شەپۆلێ بکەمەوە
گوێ ڕادێرم
بۆ زرینگانەوەی جامەکان
بۆ زایەڵەی شکانی شووشە دڵ
بۆ دوورینەوەی لێوی ئەو چیرۆکەی
کە ئیدی بەسەرهاتەکان ناگێڕێتەوە
بۆ ئەو گۆرانییەی کە ژێی ویلۆنی
ئاوازەکانیان گرێ دەدەن
تا درەختەکانی چاوەنواڕی نەبن بەبەرد
ڕووبارەکان وشک نەبنەوە
تا گوڵەگەنمەکان بپشکوێن
تەنێ زەردەخەنەیەک بەس بوو...!

لە نێو چیمەنی وشکەلانی ڕەنج بەخەساری
ئەو ڕۆژانەی کە شەوانی شەکەتی تاریکیم بوو
تەنێ باڵای دیوار
چاوی دیوار
گوێچکەی دیوار
بەشی ژەمێک یان دوو ژەم
قاپێک شلەی ساردو لە بن دەرگا بەجێماو
لەو کونجەوەش بەد بەختانە



بەسیمای تاڵی ئەو ڕۆژگارە خەنیمەوە
بەخیانەتی گوڵ، لە گەڵاکانی
پەپوولە لە ڕۆشنایی چرا
ئاو لە ماسی
ڕۆژگاری نەفرین
لە گرنژینی زارۆکێکی سێوی،

لە بێ تۆییدا
ئازاری قورسی کێوەکانم خستە سەر پشت
بەسەر شەپۆلەکانی حەسرەتدا پەڕیمەوە
تنۆک تنۆک خوێنی گەشم
بەخشی بەگوڵی سوورو
بەرگی تۆم لە گەڵاکان چنی
شەوانە
چراکانم یەک یەک دایساند
بادەکانم پڕکردن لە خەون
لەسەر تەرمی لاپەڕەی ڕۆژ ژمێری نائومێدیم
ڕاکشام
ڕۆژێ... دووان
شەوێ... دووشەو
ساڵێ... دوو ساڵ
من دەنگی خۆم دا
بەو برینانەی کە نەبوون بەکانی گوڵاو
بەمێرگی بیابان و تراویلکەو کۆچ و مەرگ

بەمزگێنی بۆ سەرفرازی عیشقی نێوان
گوڵ و پەپوولە
دۆستایەتی تفەنگ و کۆتر
ئارامی نێوان گەردەلوول و سروە،

بیابان بوو
دوا هەوارو مەنزڵم
تۆ گیایەک بووی لە ڕۆحمدا ڕوای
هەرچی ئەسید بوو
خرایە نێو خوێنی دەمارە سڕبووەکانم
هەرچی تیغ بوو بووە میوانی هەمیشەیی زامەکانم
ئەفسوونی نووشتەکان بەتاڵ بوونەوە
ئەو کتێبانەی
کە میراتی شکۆمەندی
خەنجەرە ژەهراوییەکەی
بەر پشتێنی بابە گەورەم بوو
لە هەر دەرگیرییەکڕا خەرمانەی برینەکانی شەن دەکرد،
لە بن سێبەری وەهمە پیرۆزەکان
خەونەکان
سواری ئەسپی فلزی تەمەننا بوون
برینەکانیش نەبوون بەکانی گوڵاو

درەختەکان بوونەوە بەرد
پەپوولەکان لە تاریکیدا مردن



ئەو مەلۆچکانەی کە هێشتا باڵیان نەگرتبوو
هەڵنەفڕین
کەوتنە بن پێی ڕێبواری سەرگەردانی جادەکان

من چیم شک نەبرد وێڕای
ئەو جووتە نەعلەی
کە لە ڕەهۆڵێکی دوو سێ مەتر دووجا
پەتێکی ئەستووری بازنەیی گرێدراو
لەوانەی هاتن
ئاویان لە کانی عاتیفەم خواردەوە
تفیان ڕۆکردە سەرچاوەکەی
لەو مێوانە ناوەختانەی کۆڵی شەکەت و حەسرەتیان دانا
لە ڕۆژانی سەخت و باو بۆران
سفرەکانیان خاڵی کرد
دەرگاکان واڵا
بەڕێوەش نهێنی نامەکانیان درکاند و
پاشەڵیان پێ سڕییەوە،
لەوانەی ڕۆیشتن و بێ ماڵاوایی
بێ ئاوڕدانەوە
لە بەسەرهاتی شەکەتی هەنگاوەکان
لە پێداچوونەوەی دواپەندی ئەو داستانەی نەخوێندرایەوە
کە تەنێ زەردەخەنەیەک بەس بوو
تاگوڵە گەمەکان بپشکوێن
مەمکی هەورەکان پڕ باران بن

خەون لە چاوی فریشتەکان نەتۆرێن
کۆترەکان بەئاسمانەوە نەکوژرێن
تەنێ...
زەردەخەنەیەک
بەس بوو.

هاوینی ١٩٩٦



## مردوو شۆر

تەرمێکی ڕەش
کفنێکی سپی
تەرمێکی زەرد
کفنێکی شین
تەرمێکی سەوز
کفنێکی سوور
دەیان، سەدان، هەزاران



هەزاران تەرمی ڕەنگاو ڕەنگ
تێکەڵ مینا ڕۆح و جەستە
ڕەگ و گڵ

زەماوەندی خوێنە
جەژنی مردوو شۆرە
شاباش سەری پەپوولەیە

مردوو شۆر تەنێ لە ژمارە دەپرسێ
چەند بستە زەوی
چەند تەرم
چەند پارە؟
نارِوانێتە باڵاو سیماو ناسنامە،
جەژنە، جەژنی مردوو شۆرە

شاباش سەری پەپوولەیە

زستانی ١٩٩٤



## پرسە

گەلاکان شیوەن ناگێڕن
نامۆیی ڕەنگیان بەوەرزەکان نەسپارد،

دەرو دیوار
جادەکان
کۆلانی تەنگ
درەختی ڕووت بووی بەر گێژەلووکەی وەرزی وەرین



شەونم یاخی بوونی بەگەلاکان گەیاند
ئیدی لە هیچ بەرە بەیانییەک
بەشەرمەزاری لەبەردەم گوڵە بێ ڕەنگەکاندا
بەکوڵ ناگری،
گەلا ڕەنگی ڕەشی پۆشی
شار سەرانسەر بەرگی خوێنین

منداڵێک گریا...
کۆترەکانی خەیاڵ کوژران
گوڵە گەنمێک ڕوا
کێڵگەیەک سووتا
کانییەک هەڵقولا
ڕووبارێک وشکی هێنا،
لە نێو ئاودا بوو،
ماسی خنکا
ئاو پرچی پەرش بووی بەقوڕ کرد

ماسیگر یادداشتی قولابی نووسییەوە
نەفرینی کرد لە مرواری،
گەڕان، شۆڕبوونەوەیە
بەنێو قوولایی نهێنییەکان
قولاب گرتی:
من نێچیری دەست ماسیگرم
بەمن مەڵێن کێ ماسی خنکاند

شەپۆل، توورە
بەردەڵانی کەنار یاخی،
هەتاو لە شەو ڕاما
مانگ لە ئاوابوونی خۆی
سەگ لە وەڕینی شوێن پێ هەڵگر
تاریکیش نەبوو
چراکان کوژانەوە،
هەتاو کچی خۆر بوو
بەتیشکەکانی خۆی سووتێنرا
لەو ڕۆژەوە سروشت بەگەدایی
لەسەر جادەکانی زەمەن ڕاکشاوە

لە وەرزەکان مەپرسن
کێ بەهاری لە پشت پەرژینەوە جێهێشت،

پرس لە وەڵام
وەڵام لە مێژوو
مێژوو بەرد نووسێک بوو تۆمارەکەی
خرایە نێو گۆمێکی مەندەوە
زەردەخەنە لە لێوی دووراو
لێو لەگەڵ مەرگی نامەکانی هەور
بێبەری لە زەردەخەنەی پەپوولەکان
برین لە ژان
ژانێک سەدان ساڵە لە جەستەی شۆڕە سوارێکی بریندارە



لە گلانی خۆی دەپرسێ،

ڕۆندک لە نابینایی چاو
سۆماکەی نە ڕابردوو، نە بەرایی خۆی دەبینێ
گەردنی بڵندی شکاوی ئەسپی خۆزگەیەکە
شۆڕەسوارەکەی بەپێوە مرد
لەسەر لووتکەی هەڵدێرێک
تەرمەکەی جێما،
کێو لەسەر کەشی لووتکە ڕاما
عاشقان بەعیشقەوە گیانیان سپارد
شەپۆلی عەتری بیرەوەری
وشک بوونەوە
کۆترەکانی خەیاڵ فڕین
گڕ لە پووشی هێلانەکان بەردرا،

کێ بوو پەپوولەی لە زەردەخەنە بێ بەری کرد
گەڵاکانی ڕەشپۆش کرد
شار سەرانسەر بەرگی خوێنین؟!

پاییزی ١٩٩٤



## دان پێدانانێکی تر

له کوێی...
ون بوویت
له من ون بوویت
بوویته تەمی گۆشەگیری ساتەکانی بەیەک نەگەیشتن
تەم، نێوانێکی ئەفسانەیییه
چارەنووس دووریانی بوو
دووری و نزیکی



له شەوی تاریکی چاوەنواڕییدا
عیشق و مەرگ
دوا هەناسە تامەزرۆیی
گڕی ئاخەکان
ڕۆشن بوونەوە

دەڵێن شێتی!
کەس تێت ناگا،
ئاخر شێتی ترۆپکی هەرەساوی
کێوی عیشقێکی ناکام بوو
بەزامی هەمیشە چۆڕاو و
پەنجە گڕ گرتووەکانم
یادداشتی لەسەر کێلەکان
نووسییەوە
خەونەکان، کۆت و زنجیری دیلێکی بێ چارەن
کە لە دۆزەخی ئەوینێکی نەفریندا
لەسەر پشکۆی کوانووی مەرگ سەمای کرد،
خۆ منیش ئەو دیلە بێ چارەیەم
کە تەنێ زایەڵەی زنجیری ماتەمینی
دڵنەوایی بێ ئارامیم دەداتەوە،

گڕو خامۆش بوونەوە
شیوەن و... شیوەنێکی تر
هەزاران، شیوەنی تر

بۆ لەدایکبوونی عیشقێکی تر.

دوو تێبینی:

یەکەم: بەم پێناسەیە بمناسنەوە

ناو: شەهیدی عیشقێکی نەفرین

تەمەن: گوڵی سیس بووی

پەڕەی زەردی بیرەوەرییەکان

ساڵی شێت بوون: ساڵ مەرگی خۆشەویستی

دووەم: کە خەمی ئەو ژیانە شوومە

دەخەیتە سەر کۆڵی شەکەتیت

دیواری ئەو بێ دەنگییە برووخێنە

کە بەری خۆرەتاوت لێ دەگرێ.

(*) ئەم شیعرە لە کۆتایی هەشتاکان نووسراوە درەنگ دۆزیمەوە.

وشکەڵانە
درەختەکان لە هەر کوێیەک هەن
لە بنجەوە هەڵدەکەنرێن
ڕۆژێ نییە
ساتێ نییە
سەری کۆترەکان نەبڕێن،

پەرستگا...
دەستی نزاو پاڕانەوەی
هەرچی گەداو شێت و ئاوارەیە،
زەمین، زەلکاوێکە
خواوەندی شار
مێشوولەی خوێن مژو
ژەهر بەخشە
سەراپا خاکی پاکی پێدەشت و چیا و کانی
هەڵوشیوە،

نیگەران مەبە
لەو ئاگرەی خۆی دەسووتێنێ
لەو ڕووبارەی بەدەستی خۆی
کەنارەکانی جێدەهێڵێ
شەپۆلەکانی وشک دەکاتەوە
لەو خۆرەتاوی بێ وادە
هەر لە کازێوەرا ئاوا دەبێ





## گڕێک خۆی دەسووتێنێ

بۆ شاخەوان

گەیشتی بەکاروانی فریشتە سپی پۆشەکان
بەمێرگی عیشقی پیرۆز و
ئاوی جاویدانیت خواردەوە،

زوو سەفەرت کرد
لەو سەر زەمینە ڕەش پۆشە

لەو کەوانەی یەکتر ڕاو دەکەن
سەری خۆیان دەکەنە دیاری
بۆ خوانی ڕاوکەران...

دڵگیر مەبە
لە کوێربوونەوەی کانیلەی کوێستان و
توانەوەی بەفری لووتکە
لەو هەڵدێرانەی
کە ڕێبواران
خۆیانی لێ هەڵدەدێرن
لە دیوار و سەر شەقام و
شوورای شاری نەفرەت لێکراو
لە پەیامی ڕۆژانەی لیستی مردووان،

ئیدی بۆچی نیگەرانی
کە لووتکە سەری لووتکە ببڕێ
کێو بەگژ کێودا بچێ!
بۆچ نیگەرانی
لە ژنانی ڕەشپۆشی شارەکەت
بوونەتە زیوانی هەمیشەیی گۆڕستان،

هەر تۆ تەنیا نیت
لە وڵاتی پشت هەورو
خەونی پەلکە زێڕینەکان
لە وڵاتی هەزاران تابلۆی غەمگینی



ئەستێرە چاو گەشەکان
لەوێ نەسیخوڕ هەیە
ڕاپۆرت بنووسێ
نە یاساوڵەکان
شمشێرو تفەنگ بەدەستن
نە لەسەر  هەر بستەخاکێ
زیندانێ هەڵکۆڵراوە
نە لە نێوان هەنگاو و هەنگاوێک
هەزاران مین ڕواوە
نە براکان تف لە ئاوی جۆگەی خۆشەویستی یەکدی دەکەن
نەکەسێ بەفرمێسکی ئەویدی پێ دەکەنێ
نەبازگەیەک لە ناسنامە دەپرسێ
نە تەوشی زمانی پیرەژن
ڕۆحی فەرهادەکان دەبڕێتەوە
نە تۆش بەدوو سێبەری دزراوی خۆت دەگەڕێی
نەلە دوو زەردەخەنەی تۆراوی خۆت وێڵی،

دڵگیرمەبە لەو سەفەرەت
سەفەری جاویدانی و سەرفرازییە
مێژوو بۆ خۆی نێچیری قوربانییە
 لە ئاست درۆی شاخداری پادشاو
قامچی سوڵتانەکان
مێژوو لە بوونی خۆی شەرمەزارە
لە خوێندنەوەی هەڵەبجەی جەللادەکان

دڵگیر مەبە
تۆ تەنیا نەبوویت
ئەوا زەردەشت
عیسا
حەللاج
لە خەنجەرو خاچەکەیان بپرسە
لە کفن و خوێن و خۆڵەمێش و
کتێبە پیرۆزەکان بپرسە

هەرتۆ تەنیا نەبوویت
ئەی پەرچەمی بڵندی ڕەنگاو ڕەنگی
وڵاتە بێ ناسنامەکەت

ئۆغرت خێر
لەوێ لە پشت هەورو
ئەو دیو باڵی ئەستێرە چاوبزەکان
پێیان بڵێ
ئێستا دیاکۆ(*)
تاجی سەرفرازی میدیای لەسەر ناوە
بەقەد غەمی گەورەی
کێوە سەرکەشەکان
بەقەد باڵای درێژی

(*) دیاکۆ: کوڕی شاخەوانی خوا لێ خۆشبووە.



ڕووباری خوێنی
کۆترەکان
گەورەبووە.

پاییزی ١٩٩٥



## کوردستان

گیانەکان گەڕانەوە
نێو ئەو جەستانەی
کە خۆیان لە پێستەکانیان داماڵی بوو
ئەو پێستانەی کە خۆیان لە پەیکەر داماڵی و
دەمامکە جوانەکانیش لە ڕوخسارە کرێتەکان
هەڵگەڕانەوە،



تەنگ بوونەوی مەودای حوکمی بینینی گلێنەکانە
تەنگ بوونەوەی نەفەسی عیشقە ئاگرینەکانە
تەنگ بوونەوەی پانتایی زەمینە
لە ژوورێکی چکۆڵەدا
کەوتنی هەرمێیەکانە
لە حاشاکردنی چڵی درەختەکان
خنکانی ماسیەکانە لە نائاشنایی ئاو،
هەوەڵێن چرپەی جاڕدانی
فڕێدانی ئەڵقە ژەنگاوییەکەی دۆست
هەناسەی سروەی لێبووردنی مەزدا بوو
لە بوومە شوومەکەی ئەهریمەن،
دیوارەکان پەلکە گیا بوون
باخچەی پەپوولەکان زیندان
جەژنی بەخشندەیی زامەکان بوو
لە نێزەی بوختان
دەرگیری نێوان گومان و گوناهە
ئەم کەرنەڤاڵە ڕەشپۆشە

کوردستان
نکۆڵی چرایە لە ڕۆشنایی خۆر
ماچ و زەردەخەنەیە لە لێوەکان
غەمزەیە لە پێڵووی چاو
کۆچی هەنگاوەکانە

له هاتن و هەڵاتنی دەنگی پاژنەی پێیەکان
سۆزی گۆرانیەکی ئاوارەیە
لە گەرووی خوێناوی ئاواز
گریانی بێشکەیەکە
لە حەسرەت هاتنی منداڵێکی تازە لە دایک بوو
بزەی خونچە گوڵێکی تازە پشکوتووە
لە بەرەبەیان
نکۆڵی سێبەرە سپییەکانی ئاسۆیە
لە درەخت و گەڵاو چۆلەکەکان
هەتاوی پاش بارانی زۆرە لە پەلکە زێڕینە
زنار لە دەوەن و زەندۆڵ
کێڵگە لە گوڵە جۆو گوڵە گەنم و قەتێیەکان

کەرنەڤاڵێکی ڕەشپۆشە
ڕەحمی گوڵەکانی پڕن لە بۆنی باروت
پشیلەکان لە پاڵ هێلانەی پەڕەسێلکەدا
خەوتوون

کوردستان
شمشێرێکە
تیژو
تووڕەو
لە خۆبایی

ئابی ١٩٩٦



## بارستەیەک لە هەڵم

بۆ دایکم

من لێرەم
لە ژوور سەرتەوە
بەنامۆیی هەڵکوڕماوم
هەموو ئێوارەیەک لەگەڵ خۆراوابوون
کە هەتاو بۆ دواجار ماڵاواییت لێدەکات



هەرچی پەڕەسێلکەو چۆلەکەی باخچەکەمان هەیە
ئاوێتە بەڕەنگی زەردەی گەڵای هەڵوەریوی تەمەنت دەبن
هەرچی شەپۆلی سەوزی یادەوەری منداڵیم هەیە
تێکەڵ بەشاری جاویدانیت دەبن
نامەی قوڕاوی تاریکستانی ئەم سەرزەمینە
دەبنە پەیامی پەیڤە ناکامەکانم،

شەوانی درەنگ تا بەرەبەیان
هەناسەم تەنگ وێنەی پەپوولەیەکی تاراو
باڵ دەگرێ
لەسەر چڵی ڕوخساری تەماویت هەڵدەنیشێ
بەخۆم دەڵێم ئیدی بەسە هەتا کەی
سروودی بەکوڵی ئەم گریانە بێمانایە بهۆنمەوە
لە نێو گڕکانی گوناهەکانمدا ببمە مشتێ خۆڵەمێش،
چاوەڕێی تۆفانێک دەکەم
جووتە ماسی بێهوودەی گلێنەی چاوەکانم بخنکێنێ،

وێڕای تۆ
وێڕای ئەو پەیڤە ناکامانە
کێ گوێ لە بەسەرهاتی داڕمانم دەگرێ
لە زامی قووڵی ئەو شیعرە بریندارانەم دەڕوانێ
کێ سیمای سپی کاغەزەکانی ئەوینم ڕەش دەکاتەوە

لەبەردەم کڕنوشگەی میهرەبانیت
دەستەکانت ڕامدەکێشن

لێوەکانت بانگم دەکەن
– فەرەیدون
هۆ منداڵە لاسارەکەی جاران
تۆ هەر گەورە نابیت
تا بگەڕێیتەوە نێو ئامێزی شاری بەتەم داگیراوم
مشتێ خۆڵی سووتاوی باخچەکەمانم
بۆ بهێنیتە (سووت ئیمام)(*)
ئاخر وێڕای تۆ پەرستگایەک نەبوو
هانای بۆ بەرم و لەبەردەم میحرابی میهرەبانیت ڕابمێنم
خامۆشیم بخزێنمە نێو بڵێسەی ئەو گڕە ئەزەلییە
ڕۆحە شەکەتەکەمی پێ گەرم بکەمەوە
بەهەڵپرووکاوی لە نێو مەنجەنیقی پەژیوانی
ببمە بارستەیەک هەڵم و سەرهەڵگرم
بەرەو تەلاری ئەستێرە پرسەدارەکان
ببمە بارستەیەک ڕۆشنایی
لەسەر باڵە تیشکدارەکانت هەڵگرم و
بتبەم بۆ ئەودیو تخووبەکانی پاکیزەیی
لە دوا وێستگەی چاوەڕوانی ئەو سەفەرە بێهوودەیە
لە خاچ بدرێم،
من هێشتا لێرە ماوم
لە ژوور سەرتەوە
تۆپەڵێک تەم و مژی سەرگەردانیم

(*) سووت ئیمام: گۆڕستانێکە دەکەوێتە ناو شاری هەولێر



گەردەلوولێک هەڵناکات
گیانم بشواتەوە
دەستە میهرەبانەکانی تۆش
لانکی خەمەکانم ڕاناژەنن
کۆرپەی دڵم هێور ناکەن
تا دەبم بەتەفسیری خەونێکی نەزۆک
لە نێو لەپی قەرەجێکی جادووگەر
دەبمە کلیلێکی بزربوو
لە نێو کیلۆنی دەرگا نهێنییەکانی ژیان
وەک گەمییەکی سەرلێشێواو
لە نێو گێژەنی دەریایەک گوناهدا دەتلێمەوە
دەبمە پرۆژەی شۆڕشێکی دۆڕاو
لە سەردەمی ناکامی باوەڕو
ئاشتەوایی براکوژەکان
ئیدی نە زەمەن بۆ پاشەوە دەگەڕێتەوە
نە خۆرەتاو لە نێو شووشەی دەلاقەکانی فەرامۆشیدا دێنەدەر
نە ئەو ساتانەش کە نیازمە
لە نێو ڕۆحی شەکەتی خۆمت وەشێرم
دەبمەوە بارستەیەک هەڵم و سەرهەڵدەگرم
بەرەو تەلاری ئەستێرە پرسەدارەکان
دەبمەوە بارستەیەک ڕۆشنایی
بەسەر هەواری ڕۆناکستانی شاری جاویدانیت
ئاوێتە دەبم بەڕۆحی تۆ

لە تۆدا دەتوێمەوە
لە تۆدا بزر دەبم
بزر دەبم
بزر دەبم
بزر

تشرینی دووەمی ١٩٩٨



## بیابانییەکان

بۆ ئەنفالەکان

لە هەموو لایەک درزی بردووە
هەموو لایەک ژەنگی هەڵێناوە
وێنەی شارە بزربووەکەمی
لە توێی چوارچێوە شکاوەکەی هەڵگرتووە،

ئاوێنەیەکە



چاوەکانت
بەم تاوسانە خۆڵاوییە
بەتەم داگیراوە
سیمای تەڵخ و هەڵپرووکاوی نامۆییت
تێدا ڕەنگ ناداتەوە
لەسەر شەقامەکانی گەورەبووندا
جاویدانیت هەنگاوەکانی لێ بەجێماوە
وێنەی جۆگەڵەی بنە دارهەنارێک
ماڵاوایی لە سێبەرەکەی خۆی کردووە،

ئاوێنەیەکە
چاوەکانت
بەوێنەی ئاوێنەی ژەنگاوی
تەم و مژی ئاسمانی خۆڵاوی
شارە بزربووەکەم،

لەم بیابانە
کەس نابینی
خەون بەو باڵدارە کێوییانە ببینێ
کە هەمیشە لە سەفەر دان و ئیدی ناگەڕێنەوە
یان بەقەد ئەو بارانە بەڕەحمەت بێ
کە لانکی خەونەکانی منداڵیت ڕادەژەنێ،
تۆ نابینی
کە شەپۆلەکانی یادەوەریت سەرهەڵدەگرن

هەرگیز ناگەنەوە کەنارە ڕیش سپییەکانی ئاسوودەیی،

تۆ نابینی
کە گەڵایەک لەسەر لکی پیرەدارێکی کلۆر
لە پایزی زەردی ژیاندا هەڵدەوەرێ
ئیدی نابێتە چەتری ئەو چۆلەکانەی
کە تەنیایی دەیانکوژێ،
لەم هەوارە سەرگەردانە
لانەیەک نابێ لە سەرماو سۆڵەی زستان
بیانپارێزێ
یان ڕەشماڵێکی کۆچەری ئەم بنار شاخە
هەرچی ئاسکە کێوی عاشق هەیە
بخاتە نێو ئامێزی،

تۆ نابینی
چاوەکانت
ئاوێنەیەکن شوێن هەڵگر
بست بەبستی ئەم سەرزەمینە جەنجاڵە دەگەڕێن
لە هەواڵی کەوەکانی نێو قەفەسی
پێدەشتی گەرمیان و
ئێسک و پروسکی خۆڵەمێشی
منداڵانی ناو تەم دەگەڕێن،

زەری لم
تۆ کچی کوێستان نەبووی!



ئەدی چۆنە لەم وشکەڵانە بەتەنێ ماوی؟
وەکو با
وەکو باران
وەک برووسکە
بەگوێی ترۆپکی چیا دوورەکان دەچرپێنی
لەم شەوەزەنگە وەحشەتەی چارەنووس
بەنهێنی وەکو شەوڕۆ
بەرگی لمت پۆشیوە
بەنێو کووچە و کۆڵانی شاری عەشقدا وێڵی(*)
لە ناسنامەی پاکیزەیی خۆت دەگەڕێی
لەو قەڵا سەختەی ژیان
کە بەمەنجەنیق و زنجیر گەمارۆ دراوە
چراکان خۆیان دەکوژێننەوە
تۆ تیشکەکان دەکەی بەپەیژە
بەسەر خۆردا سەردەکەوی،

بەمن ناڵێی
کام چۆم
کام ڕووبار
تۆی گەیاندە ئەم وشکەڵانە
تا لەو خاکە عەرعەرییە

(*) (جەلالەدینی ڕۆمی) دەڵێ: (بەهفت شهر عشق را عطار گشت، ماهنوز اندرخم یک کوچە ایم) واتە: عەتار بەحەفت شاری عیشقدا گەڕاوە، ئێمە هێشتا لە پێچی کۆڵانێکداین.

لە حەسرەت ئەوینی کوڕە چاومامزەکانی کوێستان
سەرهەڵبگری،
گوڵەگەنم ئاسا
مەمکەکانت پڕ شیر بکەی
بۆ شکانی تێنوویەتی فەرەقەتێی بەجێماوی
نێو خەرمانەی دڕک وداڵ،

بەمن ناڵێی
تۆ بەم شەوە درەنگە تا بەرەبەیان
قژی کام داستانی لێکدابڕان دەهۆنییەوە
تۆ نازانی لێرە خۆرەتاو کەی هەڵدێ
چۆن ئاوا دەبێ
باران لە کوێ دادەکا
کام مێرگ و کانی لە تێنوویەتیدا وشک دێنێ
کەسیش لە نهێنی مەرگی کەوەکانی کوێستان ناگا
پەڕەسێلکەکانیش نازانن بۆچی دەمرن
چما ماسییەکان
لەسەر ئەو هەموو کەنارە غەریبەی
دەریای
حەسرەت
خۆیان دەخنکێنن

لەم بیابانە
کێ گوێ ڕادەدێرێ بۆ فرمێسکی شەونم



هەناسەی گۆرانییە شینەکانی لم،
ئەم ئاتەشکەدەیە
تنۆکە فرمێسکێ بۆ حەسرەتەکانی ئاگر
نزای ئەو شمشیرە برینداره دەڕێژێ،
کێ دەکارێ
بەنێو لەشکری ڕم و نێزەو خەنجەر
بەنێو مەرزی خێوەتنشینان ڕاببورێ،
ئاخۆ وێرای ئەو کێلە لمانە
کێ نوێژی جەماعی مردن
لەبەردەم قەڵغانی بەڵا دابەستێ
لەو خەرەندە بودڕە
بەباڵای تارماییەکان هەڵزنێ،

زەری لم
تۆ جاران کچی کوێستان بووی
بەڵام ئێستا کەنیزەیەکی بیابانی
لەسەر سنگی دڕکنی
بازاڕەکانی عوکازدا
سەما مەرگ دەکەی
کە ناڵەت بەگوێی چیاکاندا دەچرپێنێ
ئەو چۆم و ڕووبارانە دێنە جۆش و خرۆش
کە گورگی بۆر ئاگر دەگرێ داوێنی
خێوەت دەبێ بەکاشانە
لەسەر تەرمی دڵدارە بەچاڵ کراوەکەت

زەماوەندی مەرگ ساز دەکەی،

لێرە وێڕای گەردەلوول، پەیامێ نییە
هەواڵ بەتاشەبەرد و ئەشکەوت و لووتکە بگەیەنێ
چۆن بەبەر چاوی هەموو فریشتەکانی ئاسمان و سەر زەمین
خواوەندی مەرگ
لە نێو ڕەحمی ئەم بیابانە نەزۆکەدا
تۆوی مردن بۆ مەم و زینەکان دەچێنێ

هەر کێڵەو بەدوو گۆڕی ون بووی خۆی وێڵە
هەر چاڵەو شێوەن بۆ تەرمی خۆی دەگێڕێ
لێرە لەم شەوەزەنگە وەحشەتە
کە هەمیشە خۆری لێ گیراوە
لەو خەرەندە بودڕە
لەو قەڵا سەختە لماوییە
بەچاوی کوێر و
دەستی بڕاو و
لاشەی تێکشکاو و
بۆ سەردانی جل و بەرگ و پێڵاو و
یادگاری بەجێماوی پەڕەسێلکەکان
بۆ چۆمی هەتککراوی زەری کوێستانم
هاتووم
تا بەبەرچاوی ئەم خێوەتە ڕەشتاڵە و
ژەنگی ئاوێنە شکاوەکەم بسڕمەوە



گلێنەی چاوەکانم بدۆزمەوە
شاری مردووانم بگۆزمەوە
لەسەر شەقامەکانی گەورەبووندا
جاویدانی هەنگاوەکانم هەڵگرمەوە
لەم شەوەزەنگە وەحشەتە
کە هەمیشەو هەمیشە بێ ڕۆشنایی چرایە
هاتووم شەقێک بدەم لەو گۆی زەمینە
کە هێشتا
لەسەر پشتی ماسی و
قۆچی گایە.

هاوینی ١٩٩٩



## بۆ موسا عەنتەر

لە سپێدەی تەمتومانی زستانێکی ئامەدیدا
شەرابی نەمری عیشقێکی ئەزەلی نۆشی
چەخماخەی گوللە بارین بوو
لە ژێر ڕەحمەتی برووسکەی نیگای چاوێکی بەستراو
ڕێژنە گوللە بەرەو لوولەکەی خۆی گەڕایەوە
گڕی گرت و
دوا گۆرانی بۆ پیرۆزی باران چڕی



بەرگی پەلکە زێڕینەی پۆشی،
بەم تۆف و کڕێوەیەش
گەرەکی بوو لە گەڵاڕێزانی پاییزێکی ئاراراتیدا
جەستەی ماندووی بەنێو گەردی ئەو خۆڵەی
کە ئێژی کەڵبەی تیژی گورگی ئەنادۆڵە
وەربدەی
فیشەکێک گەڵای تەمەنی تۆی هەڵوەراند
وەلێ
نەوەکانی سوڵتان نەیانزانی
مەرگی تۆ زەردەخەنەیە
بەسەر پەیژەی سەرفرازیدا سەردەکەوێ
هاواری تۆ،
بێدەنگی سنوورەکان دەخنکێنێ
ترس دەتۆقێنێ

مەرگی تۆ
شۆڕ بوونەوەیە بەنێو ڕەهۆڵە تاریکەکانی مێژوو،
قامچییەکان
گوێت بۆ رانادێرن،
مێژووت ئەشکەوتێکە
ساڵەهایە بەسەر خۆیدا داخراوە
تۆ هاتی دەرگای پیتەکان بکەیتەوە
هانای دڵۆپێک ئاو بێنی
بۆ قورگی وشکی کانیاوەکان،

لەتێ نان بووی بۆ زگی برسی بلەنگازان
تۆ هاتی کۆتی دەستی ماندووی ولاتێ بکەیتەوە.

ساڵەهایە، قیژەیەک لە ناخیدا دەزرنگێتەوە
لای لایەی خەوی خۆشی سێوییەکانە
سەدان ساڵە مارێکی شاخدار رایدەژەنێ،
زایەڵەی شەپۆلی دەریایەک هەنگوینە
ئەژدیهایەک لە سەرچاوەڕا هەڵیدەلووشێ

تۆ هاتی گوڵە گەنمی تێراوی
دەشتی سەوزی بەهارێکی چاوەڕێ بدوورییەوە
کۆتری سپی نێو قەفەسێکی ئاسنین بەرهەڵدا بکەی
تاچاو بڕ دەکاو بزر دەبێ، بەرەو رەهایی بیفڕێنی

لە شەوێکی درەنگی هاویندا
چرای چاوی ستێرەکانی ئاسمانی دێرسیم
ڤێکڕا کوژانەوە
خۆر تیرۆر کرا...

بەو شەوە تاریکە،
کە رۆشنایی تاقە چرایەکیش بەدی نەدەکرا
خوێنە رژاوەکەی
بووە خۆرەتاو و هەڵات
تارای سووری سپێدەی ئازادی
نەورۆزێکی تازەی هەڵدایەوە.

زستانی ١٩٩٤



## چەمەرییەکانی من...

زیخەڵانە
هەواری ئەم پیرە درەختە کلۆڵە
کەلەبەری وشک بووی پەلکە گیاکان
چەندین وەرز
چەندین ساڵ
هەر خوێنە بەرگی گەڵاکان...
درەختە و سێبەری بۆ خۆی نییە



لە ڕەگەکان هەڵگەڕاوەتەوە،

من نەمزانی
ئاخۆ ڕەگەکان لە ڕەگەزی بەردبوون تا گەڵاکان
تەرم ئاسا بێ ناز هەڵوەرن
لە پاڵ ئەو سێبەرە سوورانەش
چەندین خەرمانەی تەرمی زیندوو
لە نێو شەپۆلی گڕێکی هەڵچوودا
لە ئاویلکەدان بێ!

درەختەکان چوونەوە نێو ئینجانەی فەرامۆشی
پردەکان
بەسەر ڕووبارەکانەوە ڕووخان
کۆترەکان مۆمیا کران
لە نێو هێلانەی دڕکندا
خەونی هەڵفڕینیان
بۆ باڵندەکانی دارستان شی کردەوە
کە لە نێو قەدی کلۆری ئەو درەختانە
هێلکە زێڕینەکانیان
بێچووە ماری لێ ترووکا
مارەکانیش باڵی داڵیان لێ ڕوا،

ئەو شەوانەی قەڵای ئەو مێردانە بوون
تەمەنی درێژی نامۆبوونیان
لەبەردەم هەتاوی خۆشبەختی ڕاکشاند

له خولانەوەو
هەڵاتن و
ئاوابوونی خۆر
شەربەتی شەهادەتیان نۆشی
بەدیداری تیشکەکان
شاد نەبوون
قودسییەتی مردن بوو
گۆرانییان بۆ پێشوازی تەڕی باران چڕی و
بەر لە داکردن وشک بوونەوە
بەرەبەیانی وڵاتی زیخەڵانە
یان واڵاکردنی گرێیە ئاڵۆزەکانی دەروونی
ئەو مێردانەی
بەچاوی خۆیان
مەرگی درەخت و کۆترو
سووتانی
هێلانەکانیان بینی،
بەسۆزی گۆرانییەکی ئاوارە
لە گەرووی خوێناوی ئاواز
بەماچی ژەهر
زەردەخەنەی سەراب
چەمەرییان گێڕا
بۆ سەفەری
سەختی ئەو ڕێبوارانەی



کە لە زنارو لووتکەکان یاخی بوون،
لە سۆزی ئەو عیشقە نامۆیەی
کە تووڕەیی تەورەکانی هێور کرد و
سروودیان بۆ قات و قڕی باران چڕی
گڕە هەڵایساوەکانی ئاگرستانی کینەیان
خامۆش کرد
بوون بەهەتوانی برینی ئاوێنە شکاوەکانی ئاسۆ
سیمای تەڵخی ڕۆژگاریان سڕییەوە،

نزاو پاڕانەوەی دەستێکی شەکەت بوون
بەدوورایی و
پانتایی
تکای نیگاکان...
چەمەری وڵاتی زیخەڵانە
بەدرێژایی ڕاکشانی لەسەر شۆستەی ئازارەکان
سێبەری پیرۆزی
بەسەر هەواری ئەو درەختە کلۆڵانە پەرت کردەوە
ڕۆیشت و ئەویش...
سێبەری نەبوو.

زستانی ١٩٩٥

---

(*) چەمەری جۆرە شایییەکی غەمناکە لە ناوچەکانی کرمەشان و ئیلام بۆ جوانەمەرگان دەگێڕدرێت.



## ئاوێتەم بە

دەڕۆم هەر چەند سەرسەختانە
سەرمەستانە وێڵم
بەدوو سەرابی عیشقی مەحاڵی تۆ
لەم بیابانی حەسرەتە
بەتاقی تەنێ
کێلی گۆڕێ
بۆ یاداشتی



عیشقی نێوان من و تۆ
جێ ناهێڵم
بەنێو خێڵی تارماییبیەکان ڕێ دەبڕم
شوێنپێی هەنگاوەکانت هەڵدەگرمەوە
بەتاقی تەنێ
کێوی برینەکانم دەکێڵم
لە دوورەوە
هەناسەم ئاوێتە دەبێ بەهەناسەت
ڕۆحم دەچێتە نێو جەستەت
لە نزیکەوەش
هەناسەت ئاوێتە دەبێ بەهەناسەم
ڕۆحت دەێتە نێو جەستەم.

بەهاری ٢٠٠٦



## کوڕی خۆڵەمێش

کێ بوو
پشتی کردە باخی بیرەوەرییەکان
نەفرینی بۆ گوڵەکان نارد
لە بەردەم بووکی بارانی
عیشقی خوداییمان
تاجی دڕکنی لەسەر کرد
چەتری شەرمەزاری هەڵگرت،



گوناهی باران بوو
بێ شەرمانە تەڕی کردین
لە شیعرەکانی رووت کردینەوە

گوناهی باران بوو
ئاوێزانی ڕۆح و جەستەی
لێ یاساغ کردین
عیشقی خودایی
لێ قاچاغ کردین،

ئاخ باران تۆ کە پیرۆز بووی
بۆ وات لێکردین
لێکت کردین...

ئای گوڵە سپییەکانی دوێنێ پڕ هێویم
هەنووکە بۆ ناپرسن
پەڕەکانی یادگاریمان
ڕەش هەڵگەڕان،

ئەوە کێیە
بەم ناوەختە
چاوەڕێیە
سوارێکی ئەسپ دز بێ و
هەڵی بگرێ

تا ناو لەپی بەختەوەرییەکانی بخوێنێتەوە
چاوەڕێیە وەکو گەرداو
لەسەر پشتی شەپۆلەکان
خەون بەپەڕینەوەی
ئەو دیو کەنارەکانی ئاسوودەیی ببینێ،
چاوەڕێیە
فریشتەیەک بێ
لەو شەوە زەنگە
دەروازەکانی خۆرەتاوی بۆ بخاتە سەرپشت
چاوەڕێیە
دارستانێک خەون
بکاتە چەپکێ خۆڵەمێش
پەرداخێک زەردەخەنە
لەسەر مێزی رەبەنی
و
تەنیایی خۆی بخواتەوە،
بەباران بڵێ:
سوپاس
لە عیشقی خودایت
رووت کردینەوە...

بەهاری ٢٠٠٦

# پێرست

